# خەندە گرینۆکەکان و
# مەراقنامەی

# پیاوێکی سوریالی




ستیڤان شەمزینی

دەق



# خەندە گرینۆکەکان

و

## مەراقنامەی پیاوێکی سوریالی

ستیڤان شەمزینی

٢٠٢١



# خەندە گرینۆکەکان و مەراقنامەی پیاوێکی سوریالی

بابەت: دەق
نووسینی: ستیڤان شەمزینی
دیزاین: هەرێم عوسمان
چاپ: چاپخانەی کارۆ - سلێمانی
تیراژ: ١٠٠٠ دانە
نۆبەتی چاپ: چاپی یەکەم
نرخ: ٥٠٠٠ دینار

لە بەڕێوەبەرێتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارە سپاردنی (١٩١١) ی ساڵی ٢٠٢١ ی پێدراوە

پێشکەشە بە:

- گیانی ئەو خوشکە جوانەمەرگانەم
لە بەهاری تەمەندا مەرگ زەفەری
پێ بردن
- گیانی شەهیدی وڵات و
دەستی غەدری تۆرانیزم (شێخ
عەبدولقادری شەمزینی)
- هەردوو کوڕە ئازیزەکەم
(تاڤین) و (ڕۆڤان)
- ئەو خوێنەرانەی لە هەموو
جێگەیەک بە دوای هەقیقەت و
ماناکانی ژیاندا دەگەڕێن

## پێشەکی

ئەوەی راستی بێت، تەنها لەبەرئەوە ئەم پێشەکییە دەنووسم، تا بە خوێنەر بڵێم ئەم کتێبەی بەردەستی لە کۆمەڵێک دەق پێکهاتووە، هەرچەند کۆشش دەکەم ناتوانم ناوێکی بۆ بدۆزمەوە، کە ئایا ئەمە پۆستەرە شیعرە یان جۆرێک لە ئەفۆریزم، یان چی. لەگەڵ خۆم رێک نەکەوتم تا ناونیشانێک بەم کتێبە بدەم، ئەوە بۆ خوێنەر جێدەهێڵم هەر کەس لە روانگەی خۆیەوە و بە گوێرەی تێگەیشتنی خۆی دەقەکان لە مەنگەنە بدات و ناسنامەکەی دیاری بکات. لەمە بەولاوە لە وزەی مندا نییە ئەم کارە ئەنجام بدەم، تەنیا ئەوەندە دەزانم ئەم دەقانەم نوسیوە کە هەر یەکێکیان کۆنتێسکتێکی تایبەت بە خۆیان هەیە، ئیتر شیعربن یان نەبن، ئەم قەزاوەتە دەدەمە دەستی خوێنەر. هەرچەند بە دیتنی خۆم شیعر یەک رووخساری نییە،

ئەگەر تا ئێستا شیعری ئێمە لە دەوری گوڵ و پەپولە و ئینجانە و باخ و کانی و هتد.. سوڕابێتەوە وەک میتافۆرێک بۆ نیشاندانی ناسکیی، ئیدی دەبێت شیعری نوێ وەهاش هاوچەرخ بێتەوە، خۆی لە هیچ وشەیەکی ناو فەرهەنگی زمانەوانی نەبوێرێت. شیعر تەنیا پیاهەڵدانی ناسکانەی ژیان نییە، یان لە بنەماوە ئەوە وەزیفەی شیعر نییە، شیعر دەبێت بکوژ بێت، ئاڤانگارد بێت، رەق بێت، لەگەڵ رەقیێتی دنیای تازەدا دەست و پەنجە نەرم بکات. داوای کارێکی لێ دەکەین کە لە توانایدا هەیە تاکو بە وشە زبرەکان گۆمی بیرکردنەوە بشڵەقێنێت.

ژیانی تازەی ژێر سەیوانی شەپۆلی چوارەم، زمانێکی شیعریی تازە دەخوازێت، تازە بە مانای ئەوەیە گوزارشت بێت لە موعاناتی مرۆڤی تازە، لەگەڵ غەمە وجودییەکانی بدوێت، لەناو ئەم دەقانە ئەگەر تا ئاستێک بوارەکە سایکۆلۆژیی بووبێتەوە، دیسانەوە گوزارشتە لە غەمە گەورە ئۆنتۆلۆژییەکانی مرۆڤ. من نامەوێت لە باسی غەمە تازەکانی مرۆڤدا، بازنەکە بچووک بکەمەوە بۆ وردکردنەوەی هەندێک غەمی بچووک، لەکاتێکدا رۆژانە لەمسی ئەو ژیانە هاوچەرخە دەکەین لیپاولیپە لە غەمگینی گەورە گەورە، وەک هەر مرۆڤێکی ئەم سەردەمە خۆم لە

قەرەی ئەو ناسۆرانەی مرۆڤ داوە بەم فۆرمەی ئێوە لەم کتێبەدا بەرجەستە بووە، رەنگە ئەوەش جێگەی تێبینی بێت بوومەتە جارچی بۆ رەشبینی و پووچکردنەوەی بوون کە ژیان وەک وەیشوومەیەک دەبینم، بەلام رەنگە لێرەدا ئایرۆنییەک هەبێت، یان باس لە واقیعێکی تازە بکەم مرۆڤ تروسکاییەک هیوای تێدا نابینێت، ئەگەرچی سوورم لەسەر ئەوەی بوونی ئێمە هیچ مانایەکی نامێنێت ئەگەر ئازاد نەبین، چەمکی ئازادییش لە دیتنی ئەزدا تانوپۆیەکی فراوانترە لەو رووبەرە بەرتەسکەی خەلک بیری لێ دەکەنەوە، رەنگە هیچ نەرگسیەتێک نەبێت خۆم لە خەلک جیاکردەوە، من بەرهەمی ئەو خۆ جیاکردنەوە و خەلوەتنشینی و وەتاق مانەوەی خۆمم، جا هەر جۆرێک بم ئەوەیان نازانم.

به بیری خوێنەری دەهێنمەوە، هەموو ئەم دەقانەی لەناو ئەم کتێبەدا هەن، بەرهەمی دە دانە سالی تێرامان و سەیرکردنی منە بۆ دنیا و ژیان و وجود و کێشەکانمان لەسەر زەوی، دروست لە رووی مێژووییەوە دەستپێکی نووسینی ئەم دەقانە دەگەرێتەوە بۆ مانگی ئاپریلی ٢٠١١ تا ئەمرۆ کە ناوەراستی مانگی مەی ٢٠٢١ە. ئەمەش کۆی ئەو دەقە کورتانە نین لەو ماوەیەدا نوسیومن، ئەگەر

بەخت یاوەر بێت ئەوانەی تر لە کتێبێکی تردا چاپی دەکەین، مەرجیش نییە کتێبەکە درێژکراوە و تەواوکاری ئەم کتێبە بێت، لەبەرئەوەی هەر دوای نوسینی ئەم پێشەکییە و ڕۆژانە لەگەڵ پرۆسەی خوێندنەوەدا، جار و بار دەقێک یان چەند دەقێکی تر دەنووسم. بە کورت و کرمانجی بایی کتێبێکی تر ماتریاڵمان ئامادەیە لە ئێستا کە وەک وتم هەمووی بەرهەمی ئەو دە ساڵەن.

پێم خۆشە هەر لەم دەرفەتەدا ئاماژە بۆ ئەوە بکەم، ئەم کتێبە گەشتێکی فیکریی منە لەگەڵ دنیا، کە زۆر جار گەشتی جیوگرافیشی لەگەڵدا تەریب بووە، لەم دەقانەدا خەریکی موتوربەی فیکر و شیعر بووم پێکەوە، ناڵێم کەسی تر ئەو کارەی نەکردووە پێش من، بەڵام ئەمەش هەوڵێکی تری منە لە بواری فیکردا. ڕەنگە وا حەزبکەم کتێبەکە وەک فیکر بخوێنرێتەوە نەک شتێکی تر. دەخوازم خوێنەر ورد بێتەوە لە ناوەڕۆکی دەقەکان. لەگەڵ ئەوەشدا دانی پێدا دەنێم، هەندێک پەڕاوێزم بۆ ئەم دەقانە داناوە، بە پێویستم نەدەزانی بەڵام ویستم ڕێز لە خوێنەری خۆم بگرم و کارئاسانیی بۆ بکەم تا قووڵتر لە مەغزای دەقەکان بگات. لێ ئەمە ڕاهێنانی خوێنەریشە لەسەر تەمبەڵی و پاککردنی هەموو شتێکە بۆ خوێنەر

وەک هێلکەیەک، کە بواری بیرکردنەوەی خوێنەر تەسک دەکاتەوە، بەڵام تازە ئیشەکەم کردووە، کورد واتەنیش کردە پەشیمان بێت باشترە لەوەی هیچ نەکردە بێت.

**ستیڤان شەمزینی**

**١٥-٥-٢٠٢١**

**باکووری زەوی**

ئەشک و ئەشق
تەنیا پیتێکی کۆتایی
لێکی جودا کردوونەتەوە
بەلام لە چاوی ئاشقدا یەکدەگرنەوە

٢

پێکەنین ماسکێکە
زوو زوو فرمێسکەکانی
لە ژێردا دەشارینەوە

٣

مێشکی من
گۆڕێکی بە کۆمەڵە
خەونەکانمی تێدا نێژراون

٤

لە وێستگەی شەمەندەفەری ستۆکهۆڵم
ون بووم
لە گەراجی سلێمانی خۆم دۆزییەوە

٥

وا رۆچووینەتە
دنیای مەجازیی تەکنۆلۆژیا
ئەمڕۆ بیری خۆمم دەکرد

٦

بە نهێنی دەگرییێم
وەک چۆن لە منداڵیدا
لەژێر عەبا رەشەکەی نەنکمەوە دەگریام
ئەوسا بۆ زۆر شت
ئێستا بۆ هیچ

٧

لێم ببوورە دایە
کە هێشتا شیعرێکم بۆ نەنوسیوویت
ئاخر مەزنی تۆ
چۆن لە شیعردا جێی دەبێتەوە؟

٨

خەونە مەزنەکان
هەمیشە منداڵان دەیانبینن
بۆ ئەوەی خەونی گەورە ببینین
نابێت ڕێگە بە گەورەبوون بدەین

٩

کە نیشتمانم جێهێشت
هیچ جێگەیەک لە خۆی نەگرتم
جگە لە توێی کتێبەکان

١٠

ڕەشبینی باڵی بەسەردا کێشاوم
لەبەرئەوەی هەم عاشقم
هەم لە سەردەمی کۆرۆنادا دەژیم

١١

پزیشکەکان دوو جار وەرەمیان
لە مێشکم دەرهێنا
کەچی نەیانتوانی
شوێنی تۆ دەستنیشان بکەن

١٢

بکەوەرە پەلە پەل
ئەگەر تۆ بێی
مەرگ شەرم لە هاتن دەکات

١٣

چ گیلیتییەکە
دوای کڵاوی بابردووی
هیوایەک کەوتووین
بە سەری کەسمانەوە ناچێت

١٤

ناتوانن بگەنە من
تەنیا لە بنی رووباری شیعر و
قووڵایی عەشقدا نەبێ

١٥

هەموو شتێک بۆگەنی کردووە
تەنیا شیعرە
وەک خۆی بە بێگەردیی ماوەتەوە

١٦

نازانم چی بکەم
ئاگرێک لەناو ئێسکەکانمدا هەیە
ئەمێستا ئێسکەکانم ئەزریکێنن
بەلام ئازارەکان لەوە بچووکترن
گەورەیی عەشقم لە بیر ببنەوە

١٧

ئەگەرچی ئەمڕۆ لە دوێنێ
ژانم زۆرترە
بەلام ئەمڕۆ لە دوێنێ زیاتر
خۆشم دەوێی

١٨

تارماییەکان دەستیان لێ وەشاندم
فڕێیاندامە دەرەوەی گەردوون
کەچی ون نەبووم
عەشقی تۆ دۆزیمییەوە

١٩

خۆم بە قەرزاری شیعر دەزانم
کە یارمەتی خەیاڵم دەدات
بکەومە ئامێزی تۆوە

٢٠

خەیاڵ وزەیە
هەموو کارێکمان بۆ جێبەجێ دەکات
بێ ئەوەی پرس بە کەس بکات

٢١

ژووری خەیاڵم
پڕە لە دیمەنی خۆ رووتکردنەوەی تۆ
ئای ئەم خەیاڵە چەند سەرەڕۆیە

٢٢

زۆرجار یان هەموو کات
نووسەر دەبێت ئەو شتانە بنووسێت
بوونیان نییە
لە رێی دەقەوە بیانخوڵقێنێت

٢٣

لەناو هاوزمانەکانم

لەو شارەی میوانیِ بەردەوامی خەونەکانمە

هەمان شتم بەسەر هات

پێشتر بەسەر ئەحمەد کایادا هات

٢٤

ئەگەر خۆم بکوژم

هیچ نادۆڕێنم

لەشێکی دەردەدار رزگار دەکەم

٢٥

هەمان ئەو کاتەی سەرقاڵ بووم

بە نووسینی کتێبی عەشقەوە

دابڕان بیری لێ دەکردمەوە

هەمان ئەو رۆژانەی ستایشی ژیانم دەکرد

مەرگ بیری لێ دەکردمەوە

٢٦

ڤان کوخ دەیووت
”خەون بە وێنەوە دەبینم
دوای ئەوە خەونەکانم وێنە دەکەم“
منیش پێموایە
شیعر خەونم پێوە دەبینێت
بە پەرەموچی غەم دەمنووسێتەوە

٢٧

رابردوو هیچ خۆش نەبوو
ئێستا هیچ خۆش نییە
داهاتووش هیچ خۆش نابێت
سوری ژیانمان
لەناو ئەو هەموو ناخۆشییەدایە

٢٨

خۆشبەختی
وێنەیەکی وەهمییە
خۆمان دامانتاشیوە
وەک ئەو مرۆڤە دێرینانەی
لە بەرد خودایان دادەتاشی

٢٩

شاعیر ناتوانێ منداڵیی تێپەڕێنێت
گەورەبوون مانای تێپەڕاندنی منداڵیی نییە
بەڵکو درێژەدانە بە ڕەوتێک
سەری لە کۆشی منداڵیدایە

٣٠

هەتا گەورە بین
شتەکان بچووک دەبنەوە
من دەڕۆمەوە باوەشی منداڵی
تا دنیا گەورەتر ببینم

٣١

ژیان شانۆیەکی ئەپسووردە
نە دەگەینە هیچ کوێ
نە دەگەینەوە بە خۆمان

٣٢

سۆلۆن[١]
لە ئەسینا راگەیاندنێکی بڵاوکردەوە
«شاعیران زوو زوو خۆیان فریو دەدەن»
هەر بەراست
شاعیران بۆ ئەوە شیعر نانووسن
تا خۆیان لە پووچی ژیان بدزنەوە؟

٣٣

تا ئێرە ژیانم هێنا
ئیتر ئەم بارە قورسە
لە شانم دادەگرم

٣٤

بۆ ئەوەی ژیان
بەهای خۆی لە دەست نەدات
نابێت رێگا بە مردنی
مەرگ بدەین

[١] سولون: یاسادانەداری ئەسینایی کە سەددی شەشەم و پینجەمی پیش زاییندا ژیاوە

٣٥

زاناكانی بیۆلۆژیا كۆبوونەوە
ژیان تیرۆر بكەن
لە ڕێگای لەناوبردنی مردنەوە

٣٦

دوێنێ شەو
مەی زیادە خۆی بۆ جوبران
ڕووت كردەوە
جوبران سمارتفۆنەكەی دا بە زەویدا و
ڕۆحی ڕژاوی خۆی كۆكردەوە

٣٧

لەسەر كێلی گۆڕەكەی نوسراوە
لە تەمەنی نەوەد و نۆ ساڵی
كۆچی دوایی كرد
ئێستا زیندووی بكەرەوە و
لێی بپرسە چەند ژیایت؟
دەڵێت هیچ!

٣٨

تا زۆرتر لە بارەی ژیانەوە بزانیت
زۆرتر ترست لە مەرگ دەشکێ
زیاتریش خەون دەبینیت

٣٩

بۆی هەیە
داناکان عاشق ببن
بەڵام رووینەداوە
عاشقەکان دانا بووبن

٤٠

باشترین نووسەرەکان
ئەوانەن
دەتوانن زۆرترین درۆ
بە دەم ژیانەوە هەڵبەستن

٤١

کاتێک
بیرەوەریی سیاسییەکان دەخوێنمەوە
بە ناو مێژوودا رەت نابم
بەڵکو لە ئۆقیانووسی درۆدا غەرق دەبم

٤٢

لە فرۆکەخانەی دوسلدورف وەستاوم
بە موسافیرەکان دەبێژم
ئەگەر چاوتان بە وڵات کەوتەوە
پێی بڵێن
شاعیرێک سلاوت لێ دەکات

٤٣

لەگەڵ ژیان بەینم ناخۆشە
لەگەڵ ئەوەشدا
خووم داوەتەوە پێکەنین
پێدەچێت زۆر جدی بووبمەوە

٤٤

جاران پێموابوو دنیا دەگۆڕین
هەنووکە دەبینم
دنیا هەمووومانی گۆڕی

٤٥

سیاسییەکان
دەستکاریی مێژوو دەکەن
بۆ پەڕینەوە بەرەو ئاینده
کەچی ئاینده ئەوانی لێ نین

٤٦

به ئەسانسۆری خەیاڵدا سەرکەوتم
بەڵام بەربوومەوه
کۆشی رەقی واقیع

٤٧

له تەنهاییدا بێزار دەبین
گازندەش له قەرەباڵغی دەکەین
مرۆڤ لەیەک کاتدا
مێووژ و خورمای دەوێت

٤٨

چێژ له تەنهایی وەردەگرم
هەروەک هەڵقوڕاندنی ئەو پێکه شەرابەی
تەنیا به گەرووی خۆمدا
دەڕواته خوارێ

٤٩

بۆشاییەکان
بە مرۆڤ پڕ ناکرێنەوە
چونکە مرۆڤ
لە بۆشاییدا مەلە دەکات

٥٠

مرۆڤ بوونەوەرێکی نەفامە
زاناترین مرۆڤەکان
هێشتا لە حیکمەتی ژیان
تێنەگەیشتوون

٥١

گلگامێش لەم زەمەنەدا بژیابا
لە بری روەکی نەمریی
بە دوای گیای مردندا دەگەڕا

٥٢

تەکنۆلۆژیا
هەم ژیانی قورس کردووە
هەم ئاسانیشی کردووەتەوە
بەڵام من پێی تەنگەنەفەسم

٥٣

چیتر باسی دابڕان مەکەن
ئەوە خۆشەویستەکانمان نین
جێماندەهێڵن
سمارتفۆنەکانمان فۆرمات کردووەتەوە

٥٤

مرۆڤ کۆتایی هات
کۆمەڵێک ئەنیمەیشن
لە فەزای مەجازییدا
جێگەیان گرتووینەتەوە

٥٥

مرۆڤێک مافی لووتبەرزیی هەیە
بزانێت لەودیو ڕێی کاکێشانەوە[١]
چی دەگوزەرێت

[١] ریی کاکیشان ئەو گەلە ئەستیرەیەیە لە ملیارەها ئەستیرە و هەسارە پیکهاتووە، زەوی هەسارەیەکە لەو ملیارەهایە، جگە لە ریی کاکیشان زانست گریمانەی ملیارەها گەلەئەستیرەی تری کردووە.

٥٦

مرۆڤی رۆژهەڵاتی
یەک ئیشی بۆ چاو هێشتووەتەوە
ئەویش
بەکارهێنانێتی لە بری زمان

٥٧

شاعیرەکان شەوان فێ دەیانگرێت
دەیان وشە سەر ئەبڕن
لە پێناوی لە دایکبوونی شیعرێکدا

٥٨

شاعیرەکان لە ماڵی داهاتوودان
ئەوان مێژوو نانووسنەوە
خەون بە ئایندەوە دەبینن

٥٩

رقیان لە هەتاوی ناو ئاڵاکەمانە
ئاخر لای شەمشەمەکوێرە
خۆر لە جەلادێک زیاتر نییە

٦٠

دایکە
لێت توورەم
کە دەتزانی ژیان نقورچکەم لێ دەگرێت
بۆچی منت هێنایە سەر دنیا؟

٦١

بانگەواز بۆ خەڵکی شار دەکەم:
کێ منی دۆزیوەتەوە؟
بمگەڕێنێتەوە بۆ گۆڕستان!

٦٢

سەیرە لە زمانی کوردیدا
لە بری گۆڕ ئارامگەش بەکاردێت!
ئەرێ بە راست
ئارامی لە مردندا نییە؟

٦٣

چل ساڵە
دەمەوێت بگەم بە ژیان
تازە بە خۆم دەزانم
چل ساڵە بەناو ژیاندا رەت دەبم

٦٤

له فرانكفۆرت

سەیری باڵەخانە بەرزەکانم دەکرد

بیرم لەوە دەکردەوە

چەندێک کات ببات

ئەگەر لە سەربانی یەکێکیانەوە

خۆت هەڵبدەیتە خوارەوە؟

٦٥

پێم دەڵێن

خۆکوشتن پیشەی ترسنۆکەکانە

پرسیار دەکەم

قەت بیستووتانە

باسی ئازایەتی خۆم بکەم؟

٦٦

براکەم چاوەڕێیە

لە گەڕانەوەمدا بۆ وڵات دیاری بۆ ببەم

ئاه

شتێکم پێیە بۆ دیاری ناشێ

ڕەشبینی

٦٧

که رووم له هەندەران کرد
جانتاکەم پڕ بوو له هیوا
ئەفسوس له فڕۆکەخانەی ئارلاندا[1]
سەرەتا جانتاکەم ون کرد
دواتر خۆم

٦٨

فێرنارد ئەربیلۆت[2]
مێشکی ماندوو بووە
سەری ژنەکەی داناوە،
له گۆڕەکەیەوە
چاوباشقاڵی لەگەڵ ژنانی تر دەکا

٦٩

وێنەکانم قسه ناکەن
به بێدەنگی
چیرۆکی پیاوێکی تێکشکاو دەگێڕننەوە

---

[1] ئارلاندا، فروکەخانەی نیودەولەتی ستوکهولمه

[2] فیرنارد ئەربیلۆت ١٨٨٠-١٩٤٢ ئەکتەر و موزیکژەنی فەرەنسی، لەسەر وەسیتی خوی پەیکەریک لەسەر گورەکەی دروستکراوە و سەری خوشەویستەکەی بەرز راگرتووە. ئەمەش سالانه دەیان هەزار گەشتیاری به لای خویدا راکیشاوە.

٧٠

وێنەکانم بپارێزە
دەتوانی لە رێگەی ئەوانەوە
بمگەڕێنیتەوە نێو ژیان

٧١

رووخسارم شاشەیەکە
بیرکردنەوەم نیشان دەدا
ئیدی بۆ پرسیارم لێدەکەن
تۆ عاشقیت؟

٧٢

پزیشکەکان
بۆ دۆزینەوەی نەخۆشیی
جەستەم دەپشکنن
تێناگەن دەبێت
پشکنین بۆ رۆحم بکەن

٧٣

سەرەتا شادییم لێ بزر بوو
گووتم قەیناکە
خۆ پەژارەم بۆ ماوەتەوە
هەنووکە پەژارەشم لێ ون بووە
وا هەست دەکەم کاتی هاتووە
مەرگ بنێرێ بە شوێنما

٧٤

دەستنووسەکانیان
دانە دانە پشکنینم
هیچیان نەدۆزییەوە
جگە لە چەند شیعرێکی لاڵ

٧٥

رەنگە چیتر بیر نەکەمەوە
هیچ شتێک بایی ئەوە نەماوە
مرۆڤ بە بیرکردنەوە لێی
خۆی خەریک بکات

٧٦

بەزەییم بە مرۆڤی ئەم سەردەمەدا دێتەوە
نقومی گۆمی هەوەس و
کۆیلەی گەدەی خۆیەتی

٧٧

جارێک وتبووم
کۆرۆنا ڤیرۆس
رۆڵی پرۆلیتاریا دەگێڕێت
هێشتا بیر لەوە دەکەمەوە
بۆچی ئەمەم وتبوو؟

٧٨

لای ئەز
هیچ کێشەیەکی دەرەکی بوونی نییە
کێشە راستەقینەکە
لە ناوەوەی خۆماندایە
هیچ نەبێت ئەمە بۆ من راستە

٧٩

خۆشەویستی
نەخۆشی دەروونییە
هیچ نەبێت
لەناو نەخۆشییە دەروونییەکاندا
جوانترینیانە

٨٠

رۆژێک دێت دەمرم
هەرکەسە چیرۆکێک دەداتە پاڵم
لە ژیاندا هیچ چیرۆکێکم نەبوو
تا دوای مردنم شایانی گێڕانەوە بێت

٨١

بیری ئالکهول دەکەم
نەفرەت لە پزیشکەکان
ناهێڵن ببمەوە بە خۆم
ناهێڵن لەم دنیا پیرەدا
بۆ چەند ساتێک منداڵ ببمەوە

٨٢

ئەگەر هەموو شتێکت هەبێت
پێویست ناکات بنووسیت
من خۆم ئەو شتانە دەنووسم
هێشتا نەبوومەتە خاوەنیان

٨٣

لەوانەیە مەحمود دەروێش
منی لە خەیاڵدا بووبێت
یان کەسێک باسی منی لا کردبێت
وەک لە کۆپلەیەکدا دەڵێت
«چەند ژنێک شیتاڵ شیتاڵیان کردم»[١]

٨٤

پێم سەیرە
ئەو هەموو کاتەت هەیە
بۆ بیرکردنەوە لە من
لە کاتێکدا من لۆمەی خۆم دەکەم
ڕووداوێکی خۆش نەبووم
لە ژیانی تۆدا

[١] دیریکه له شیعریکی مه‌حمود ده‌رویش، شاعیری کوچکردووی فه‌له‌ستینی ١٩٤١-٢٠٠٨ . شیعره‌که له ژیر ناوی "من عاشقیکی به‌دشانسم"د و باس له گیروده‌یی خوی ده‌کات به ده‌ردی ئه‌وینداریيه‌وه.

٨٥

لەوە تێناگەم
کە خەڵک دەمبینن
عەشقیان بیر دەکەوێتەوە!

٨٦

بۆ خۆی مردنم لە تەمەنی گەنجیدا
پێش ئەوەی لەگەڵ دەموچاومدا
شیعرەکانم چرچ بن
دەبێتە جوانییەکی تر لە جوانییەکانم

٨٧

کە تۆ رۆیشتیت
هیچم پێ نەکرا
تەنها جگەرەیەکم کێشا
لە بری سووتوو
ئاه و فرمێسکم
تەپڵەکەکەی پڕ کرد

٨٨

کۆتا شەو
کە پەنجەکانتم گوشی
ئەو لە حزەیە لە سەرمدا بەستی
بۆ خاوکردنەوەی
گەرمی پێکەنینەکەتم بەسەردا کرد

٨٩

کاتێک گریان زۆرم بۆ دەهێنێ
خۆم رادەپسکێنم
تا بە قووڵی پێبکەنم

٩٠

ئەو رۆژەی لە ریستۆرانتەکە
یەکترمان جێهێشت
بتڵێک شەراب خواردمییەوە
دەمێک دەرگای دەکردەوە
پاڵی پێوە دەنام بۆ دەرەوە
دەمێکی تر بە پەل راکێشان
ئەیهێنامەوە بۆ ژوورەوە

٩١

سەیری ئاوێنە دەکەم
خۆم دەبینم لە دژی خۆم
خۆم دەبینم مۆرە لە خۆم دەکەم
خۆم نابینم بزەیەک بۆ خۆم بکات

٩٢

هیچ جیاوازییەک
لەنێوان گوڵی سروشتی و
دەستکرددا نەماوە
بۆ ئەوەی بازاڕی عەترفرۆشی نەوەستێت
بۆن لە گوڵەکان دەبڕن

٩٣

سەیری ژیانم دەکەن
هەر کەسە بەو جۆرەی پێی خۆشە
دەیخوێنێتەوە
کەسێک نەهات رستەیەک وەک خۆی
لە کتێبی وجودم بخوێنێتەوە

٩٤

له سلێمانییەوه تا ستۆكهۆڵم هاتم
هیچ نەگۆڕا
هەر حەماڵی ئەو ئازارانه بووم
هەمیشه شار به شار
لەگەڵ خۆمدا دەیانگێڕم

٩٥

ڕۆژێک دێت
نازانی چۆن من بدۆزیتەوه
ئادرەسم له هیچ شوێنێک نەماوه
ئەو ڕۆژه به بێدەنگی
بیرم لێ بکەرەوه
بزانه تا چ ئاستێک غەریبیم دەکەیت؟

٩٦

ئای لەو ساتەی تۆم ناسی
شتێکی سەیر بەسەر مندا هات
دنیام ژێراوژوور بوو
لەبەر خۆمەوه ئەمووت
ئیدی هیچ ژنێکی تر ناتوانێ زەوتم بکا

٩٧

مرۆڤ بۆ ئەوەی بفڕێت
پێویستی بە باڵ دەرکردن نییە
تەنیا ئاستێکی بەرزی ئیرادە بەسە

٩٨

دەریایەک شیعرم خواردەوە
هەڵمرِشتە
سەر گۆڕی باوکم
یەک دڵۆپ فرمێسکی لێ مایەوە

٩٩

دەست ئەخەیتە
سەر ئەو برینانەی خەریکە گۆشتەوزوون دەبن
ناهێڵم پرسیارم لێ بکەیت
خۆم پێت دەڵێم سێ ساڵە
کەوتوومەتە ژێر هەرەسی چیای کتێبەوە

١٠٠

لاقرتێ لە وشە پێکهاتووە

وشەش هەر چۆنێک

لەلایەن منەوە رەت ناکرێتەوە

١٠١

رۆشنبیری کورد کەسێکە

زۆرترین وەرگێڕان

بەناوی خۆیەوە بڵاو بکاتەوە

١٠٢

هەموو رۆژێک

سندوقی پۆستەکەم دەکەمەوە

چاوەڕێی نامەی کەس نیم

لەوە ئەترسم پۆستەچی

نامەیەکی تۆ بهێنێت و نووسیبێتت:

هەر کەس بە رێگەی خۆی

مارسی دووهەزار و بیست تاکو مایۆیساڵی بیست و یەکی
سەدەی بیست و یەک
«ناخۆشترین و تاریکترین رۆژەکانی باکووری زەوی»

فەرهەنگی زمانەوانیی من
دوو وشەی تێدا نییە
ئومێد و گەشبینی

٢

کەللەم ڕۆژانە دەچێت بۆ ڕاو
سەدان وشە دەکاتە نێچیر
سکی شیعرێکی پێ تێر دەکا

٣

هەموو شەوێک
بێ ڕەزامەندیی خۆم
تەنهایی قۆڵم دەگرێ و
دەمکات بە ماڵە بێدەنگەکەیدا

٤

زۆر حەسود بووم
ئیرەیی بەو مرۆڤانە دەبەم
لەم ڕۆژگارە گرینۆکەدا
دەتوانن پێبکەنن

٥

پەشیمانم
لەو شیعرانەی بۆ عەشق نوسیومن
تەنها و تەنها لەبەرئەوەی عەشق
لە مردن دەچێت

٦

بە دەنگێکی زۆر نزم دەگرییێم
بە ئاستەم خۆم گوێم لێیە
نازانم لە دووری دوورە
تۆ چۆن گوێت لێیەتی؟

٧

گەر تۆ بڕۆیت
تکا ناکەم بگەڕێیتەوە
بە فرمێسکیش پێشت لێ ناگرم
دڵم دەنێرم بە شوێنتا

٨

ژیان خۆی گرێکوێرەیە
هەموو لە هەوڵی کردنەوەیداین
کاتێک دەیکەینەوە
لە تابوتێکداین بەرەو قەبرستان

٩

شیعرەکانم دڵخۆش نین
هیچ کاتیش ناتوانن دڵخۆش بن
چون سەریان بردۆتە
ئەودیوی کەوالیسی ژیانەوە
هیچ نابینن، هیچ هیچ
جگە لە تاریکایی

١٠

بێدەنگی جوانە
بەڵام بێدەنگ کردن
لە گەڕەلاوژە سامناکترە

١١

کەم کەس هەیە جەرائەتی هەبێ
وەک من خۆی رووت بکاتەوە
وەک من دڵ بنێ بە دڵی هەقیقەتەوە
وەک من دان بنێ بە گوناهێکدا
رەنگە لە داهاتوودا بیکات

١٢

بە دیار پەشۆکاویی خۆمەوە
کز کز ئەسوتێم
لە داهاتوو تۆقیوم
کە دەبینم بێهودەیی
چوارمشقی لەسەرمدا دانیشتووە

١٣

تەمەنم وا بە کۆڵی ژیانەوە
نازانم کەی ماندوو دەبێت و
لە کوێ بارەکەی دادەنێ؟

١٤

له كتێبه تۆز لێنیشتووەكانی مێژوودا

حیكمەتێک هاته دەرەوه و پێی گووتم

تۆ دەرەقەتی رق نایەیت

برۆ وێڵی خۆشەویستی به

١٥

ناچاربووم لەگەڵ راسیستەكان بژیم

ئەگەر مردم

بمگەڕێننەوه بۆ وڵات

خۆ ناچار نیم

له گۆڕیشدا دراوسێی یەكێكیان بم[1]

١٦

ئەو فیڵانەش مردن

جاران له كتێبەكانم دەكرد

بەوەی بەرگی رۆمانەكانی پاولۆ كۆیلۆم دەدا

له كتێبه ترسناكەكانی ماركس

---

[1] ئیجاكه له چیرۆكی "خوم و تەرمەكەی تەنیشتم"ی "د.مەسعود عەتایی"یەوه هاتووه. بەلام بیرم نییه له كوی خوێندوومەتەوه.

١٧

دێڕێکی کاڵبووەوەی کتێبی ژیانم
دێڕێکی تۆخی کتێبی عەشق
دێڕێکی گەورە و تۆختری
کتێبی مەرگ

١٨

روانینم توێ توێ بووە
ئێمە لەودیو
پەنجەرە شەفافەکانی تەکنۆلۆژیاوە
زۆر لە یەکتر نزیکین
لە هەمان کاتدا زۆریش دوور

١٩

درێژترین نامە بۆ یار:
ئەگەر تۆ بێیت
مردن رادەکات

٢٠

مرۆڤی ئەم چاخە
مەحکومە بە گەمژەیی
لە پێناوی گەیشتن بە خۆشگوزەرانی
لە ئەشکەوتی ئایندەدا،
هەموو لەحزە شادەکانی ئێستا
گڕ تێبەردەدات

٢١

نیچە دەیگووت
«لە ناخی هەر مرۆڤێکدا مەیمونێک هەیە»
ئەوە بۆ کۆتایی سەدەی نۆزدە وابوو
ئەمێستا لە ناخی هەر یەکێکماندا
کەمتیارێک هەیە

٢٢

زۆر جار وا دەزانین
هەندێک لە مرۆڤەکان بێ ماڵئاوایی دەڕۆن
گەر بە چاوی ریپۆقاوییەوە سەیر نەکەین
دەمێکە دەستی ئۆغرکردنیان
بەرز کردووەتەوە

٢٣

مەمکی مەراق ئەمژم
کۆپلەیەکی سووتاوم
لە دیوانی شاعیرێکی خۆکوژ
لەگەڵ ئەوەشدا پێم خۆشە
غەزەلەکانی سولەیمان[١]
بە گۆرانی بڵێمەوە

٢٤

خۆم شلتر دەکەم
بەڵکو خودایە
«با»ی خەیاڵێک هەڵمگرێت
لە باوەشی تۆدا دامنێ

٢٥

تۆ ژنێکی ونیت
گەر من خەنەی عەشق لەسەرت نەگرم
گەر من دەستت نەگرم بۆ نێو شیعرەکانم
کێی تر ئەو چاکەیەت لەگەڵ دەکا
بە کۆڵ دەتپەڕێنێتەوە
بۆ ئەمبەری خۆشەویستی؟

---

[١] ئاماژەیە بۆ غەزدلەکانی پادشا سولەیمان، لە سفری سروودی سروودەکانی کتیبی پیرۆز- پەیمانی کۆن "تەورات".

٢٦

راستییەکی ڕەهایە
هەتا دنیا بچووکتر بێتەوە
غەمەکان گەورەتر دەبن

٢٧

تا دێت
ژیان شەکەتترمان دەکات
بێ بەزەییانە
پاڵ بە عەرەبانەی تەمەنمانەوە دەنێ

٢٨

لە ڕابردووم مەکۆڵەرەوە
ئێش و هەنسک دەتخۆن

٢٩

هاوڕێ
چل ساڵ زیاترە
ڕۆحم وەک کۆترێک
لە نێو هەردوو مشتمدا ڕاگرتووە
ڕەنگە بەم زووانە دەستەکانم بکەمەوە

٣٠

دەمەوێت لە قەڵای خەیاڵ
بێمە دەرەوە
لەولاوە پۆلیسی وەنەوز دەمگرێت
بە کەلەپچەکراویی فڕێمدەداتە
زیندانەکانی خەونەوە

٣١

شێوەکارێکی سەرکەوتووم
کاتێک پۆرترێتی خۆم دەکێشم
شێوەم دەچێتەوە سەر یار

٣٢

کاتێک «مارکس»م ناسی
تەمەنی سەد و حەفتا و پێنج ساڵ دەبوو
منیش تەمەنم حەڤدە بەهار بوو
ئەو پیرەمێردە پیری کردم

٣٣

بیرم نایەت
لە کەیەوە قسەم نەکردووە
بەڵام دایکم دەیگووت
لە یازدە مانگییەوە زمانت پژاوە

٣٤

لەوەتی لە ئەڵمانیام
بە دوای «گۆتە»دا دەگەڕێم
پرسیاری زۆرم هەیە
لە بارەی دکتۆر «فاوست»ەوە[1]

٣٥

هەمیشە لە دۆنادۆندام
دەمێک بوونەوەرە تایبەتەکەی
«دکتۆر فرانکنشتاین»[2]م
بەدووی هاودەمێکدا دەگەڕێم
دەمێکی تر فلیچەرم
بە دوای ئازادییدا وێڵم[3].

[1] "فاوست" ناوی داستانە شانویەکی نووسەری بەنامیی ئەلمانی «یوهان گوتە ١٧٤٩-١٨٣٢»یە.

[2] ئاماژەیە بو روٖمانی «فرانکنشتاین»ی نووسەری ناودار «ماری شیلی» کە باس لە دکتوریک دەکات بە ناوی فرانکنشتاین بەوەی بوونەوەریکی نامو دروست دەکات، ئەو بوونەوەدرە نە قبول دەکری و نە ئافرینەرەکەی بەوە رازی دەبیت هاودەمیکی بو دروست بکات، ئەمەش سەرەتای رستیک تراژیدیایە.

[3] ئاماژەیە بو کەسایەتی «فلیچەر» لە رومانی «جوناسان»ی «ریچار باخ» کە نەورەسیکە لە ئازادیی دەترسیت.

لۆژیکی ژیان
وەکو لۆژیکی هۆلیۆد وایە
بۆ رزگارکردنی تاکە کەسێک
دەبێت سەدانی تر بمرن

٣٧

زۆرجار پێم خۆشە
بۆ دیوارەکان بدوێم
هیچ نەبێت گوێیان
لە گوێی سیاسییەکان سووکترە

٣٨

حیکمەتە رۆژهەڵاتییەکان
سەدان ساڵە
باسی دڵشکان دەکەن
تازە زانستی رۆژئاواییەکان
پێی دەگات!

٣٩

زۆرجار مێشکم دەگوشم
دڵۆپێک بیرکردنەوەی لێ ناچۆڕێت
زۆر جاری تریش
بیرکردنەوەم هێندە فراوانە
پێویستم بە چەندان مێشکی تر هەیە

٤٠

هەرچەند دەکەم ناتوانم
کتێبی «چل ڕێساکەی عەشق»[١] بخوێنمەوە
ڕێسادانان بۆ عەشق
بە کارێکی گەمژانە دێتە بەرچاوم

٤١

تا ژان و ئازارم پتر بێ
زیاتر شیعر دەنووسم
گەر ڕۆژێک قورگی شیعرم نووسا
هیچ ئازارێکم نەماوە

---

[١] ئاماژەیە بۆ ناوی یەکێک لە ڕۆمانەکانی "ئەلیف شەفەق". لێ دەزانم تیمای سەرەکی ڕۆمانەکە دژ بە دنیای ڕووکەشپەرستی ئێستا نووسراوە، بەڵام بەشێوەیەکی ئایرۆنی کەڵکم لەو ناونیشانە وەرگرتووە.

٤٢

هەتا دوورتر بم
نووسینەکانم زۆرتر لێتان نزیک دەبنەوە
هەتا زۆرتر ون بم
شیعرەکانم زیاتر دەدرەوشێنەوە

٤٣

سەفەرکردن
تەنیا گەشت نییە
بە نێو جوگرافیاکاندا
جڵەوشلکردنیشە
بۆ غاردانی ئەسپی خەیاڵ

٤٤

کتێبفرۆشەکان
نازانن چی میکرۆبێک
لە ناواخنی کتێبەکاندایە
ئەگەرنا وازیان
لەم کەسابەتە دەهێنا

٤٥

نیتچە

ئازاری زۆری دام
بە کتێبەکانی کەوتە وێزەم
دەرگای دۆزەخ و بیرکردنەوەی
بەیەکەوە بۆ کردمەوە

٤٦

سیاسەتمەدارانی ئێمە
هیچ نەما نەیدزن
ئێستا چاوی تەماحیان بڕیوەتە
ددانە زێڕەکەی کەریم خانی زەند و
زرێ پۆلاینەکەی دیاکۆ

٤٧

هێندە تەنیام
شەو تا بەیانی نوکتە بۆ خۆم دەگێڕمەوە
تەوقە لەگەڵ خۆم دەکەم
پیاسە لەگەڵ سێبەرەکەم دەکەم
کە ڕۆژ دەبێتەوە
دەنکێک حەبی سەرئێشە دەخۆم و دەنووم
بێزارم لەو پیاوە زۆربلێیەی ناخم

٤٨

ئاه قاچم هەڵخلیسکا
کەوتمە ناو ئاگرەکەت
من و ئاگرەکەت
لەناو یەکدا جێهشت

٤٩

چوومەتە بن هەنگڵی برینەکانم
وەک ئەکتەرێکی مۆنۆدراما
هەر خۆم دەبینم
بە دیار برینەکانەوە ئێشکم گرتووە

٥٠

رمێکی دووسەرم بە دەستەوەیە
سەرێکی ئارەزووەکانمە
سەرەکەی تریشی شیعرەکانم
نازانم کام سەریان
دڵی یار دەگرێت؟

٥١

پەنجەرەکانی بیرەوەرییت
وەک گۆزەی دڵم شکاند
بە خوێن ساردییەوە وتت
گەورە بووم
لە شیعرە بچووکەکانتا
جێم نابێتەوە

٥٢

ژیان لە فیلمێکی خراپ دەچێ
لە سەرەتاوە دوا گرتەی دەزانین
هێڵنجم دێت ئەی مەرگ

٥٣

گەر منت خۆشبوێ
دەتوانم بارتەقای ئەلیزا
خۆشم بوێی
بەڵام ناتوانم بەڵێن بدەم
شیعری تەڕتر
لەوانەی «ئەراگۆن»ت بۆ بنووسم[1]

[1] ئاماژەیە بۆ خۆشەویستی نێوان شاعیری چەپڕەوی فەرەنسی "لویس ئەراگون" و "ئەلیزا" کە ٤٠ ساڵ زیاتری خایاند. ئەراگون لەو چل ساڵەدا سەدان شیعر و دوو دیوانی تایبەتی بۆ نووسی.

٥٤

ڕێگەت لێ گرتم
لە شیعردا بتنووسمەوە
خۆ ناتوانیت
ڕێ لەو خەونانەم بگریت
بە ڕووتی دەتهێننەوە باوەشم

٥٥

بیرکردنەوەی گشتیی
بۆنی جارسکەری پارەی لێدێ
بیرکردنەوەی منیش
بۆن عەتری کتێب

٥٦

لە دەستە ڕاستم
گۆمی فرمێسکەکانت هەیە
لەلای دەستی چەپیشم
ئاگردانی حەسرەتەکانت
خۆت دەزانی
مرۆڤێکی چەپرەوم

٥٧

هیچ داوایەکم لە فەمانڕەوایان نییە
مەگەر وەک «دیۆجین»[1] بلێم
بە پۆلیسەکانتان بلێن
بەری ئازادییمان لێ نەگرن

٥٨

لە گاتاکاندا[2]
ئاهورامەزدا دێڕێکی بیر چووە:
مرۆڤ بە «هەقیقەت» بە بۆن دەکەوێ

٥٩

ئازادیی وەک ژنێکی سۆزانی
رووت و قووتە
ئەوە خۆمانین بە پۆشاکی قەدەغە
پۆشتە و پەرداخی دەکەین

---

[1] داستانی دیوجیز و ئەسکەندەری مەکدونی لە ئاستی گەلیریدا بەربلاوە. جاریک ئەسکەندەر ددچیتە لای دیوجینی فەیلەسوف و پیی ددلیت هەر داوایەکی هەیە بوی جیبەجی ددکات، بەلام ئەو پیی دەلیت تکایە خوت لا بدە و بەری ئەو خوردم لی مەگرە.
[2] کاتاکان بەشیکی بنەردتی لە کتیبی "ئاویستا"ی زدردەشت پیکدەهینیت.

٦٠

کاتێک بیر لە بوون دەکەمەوە
پەنا بۆ کتێبی «دا زاین»[١] نابەم
لە پشت پیانۆکەی «چایکۆفیسکی»[٢]یەوە
خۆم حەشار دەدەم

٦١

دەفتەرێکم شاردووەتەوە
بۆ هەزار پەژارە
تەنیا یەک جار دەنووسم
غەمبارم!
دەبێت لەمەودوا
رۆژی هەزار جار بینووسم

[١] ناونیشانی کتێبێکی فەیلەسووفی ئەڵمانی مارتن هایدیگەرە لە باردی بوون و لێرەدا بوون.
[٢] پیتەر ئیلتیچ چایکۆفیسکی ١٨٤٠=١٨٩٣ گەورە موزیسیون و نووسەر و مایسترۆی رووسی و جیهانییە.

٦٢

لەناو «کارتۆفل»خۆرەکاندا دەژیم[1]
لەبەر غەم خواردن
نەپەرژاومەتە سەر خواردنی پەتاتە
ئەرێ پەتاتە تامی چۆنە؟

٦٣

خۆشەویستی نینۆکی تیژە
جارێک لە رۆحم گیر دەبێ
جارێکی تریش لەو گۆرانییەی
بڕیارە بیڵێم و بۆم ناوترێ

٦٤

لە هەر شارێک چیرۆکێکم هەیە
لە ستۆکهۆڵم چیرۆکێکی تاڵ
لە پاریس چیرۆکێکی سوێر
لە بیلەفێلد چیرۆکێکی تفت
لە سلێمانی شیرینترین چیرۆک

[1] کارتوفل بە مانای پەتاتە دێت. ئەلمانەکان بە پەتاتەخورەکان ناسراون.

٦٥

سەرلەشکری سوپای زووخاو بووم
سەربازەکانم یەک یەک
لێم هەڵگەڕانەوە
دانە دانە بەرگی غەمیان
لەبەردەم قەترەیەک شادیدا دادڕی

٦٦

نازانم بۆچی
پاڵتۆی نائومێدیی لەبەرم داکەنم؟
نازانم بۆچی
پێویستە تۆزێ رووناک بم؟
نازانم بۆچی ئەم پرسیارانەش دەکەم!

٦٧

جارێک بیرم کردەوە
هەموو ژیان
لە میکرۆ چیرۆکێکدا[1] بنووسمەوە
شەش جار نووسیم
کوێرەوەریی

[1] میکرو چیروک کورتترین جوری چیروکه و تەنها له شەش وشه پیکدیت.

٦٨

له خۆرئاوا

هەموو شتێک ئاوا بووە

بە خودی مرۆڤیشەوە

له خۆرهەڵات

هیچ شتێک هەڵنەهاتووە

بە خودی مرۆڤیشەوە

٦٩

ژیانی ئەتککراوی ئێمە

لە رۆژهەڵات

ئەو مانا قەشەنگەی

بە رۆژئاوا بەخشیوە

٧٠

نووسەرەکان

بۆ تەنیایی خۆیان دەنووسن

خوێنەران

رایاندەکێشنە ناو ئاپۆراوە

٧١

هەموومان لە زینداندایین
مەبەستم زیندانە کلاسیکییەکان نییە
نا، نەخێر
زیندانی سۆسیال میدیا

٧٢

لە سەردەمی خێراییدا
نامەکانی خۆشەویستی
درەنگتر دەگەن
یان هەر ناگەن

٧٣

مرۆڤی ئەم چەرخە نەخوێندەوارە
توانای خوێندنەوەی فرمێسکی نییە
بە حونجەش پێکەنینی پێ ناخوێنرێتەوە
چ نەگبەتێکە مرۆڤی سەردەم؟!

٧٤

به كاميرامانه‌كه‌م گووت
وێنه‌یه‌كم بگره
به‌ڵام با ئازاره‌كانم نه‌بینرێن

٧٥

شیعر ده‌نووسم
بۆ هه‌موو كه‌س و
بۆ هیچ كه‌س
شیعر ده‌نووسم بۆ كه‌سێك
هیچ شتێكی له باره‌وه نازانم

٧٦

سه‌ره‌تا دوای كتێب كه‌وتم
پاش ماوه‌یه‌ك دوای عه‌شق
كاتی هاتووه
بگه‌ڕێمه‌وه بۆ لای خۆم

٧٧

زۆرینەمان ژیان ناناسین
پێدەچێ تا مردن وا بمێنینەوە
ناسینی ژیان
لە مەرگ زۆر سامناکترە

٧٨

ژنەکان وەک ئەوەی سەیری ئاوێنە بکەن
خۆیان لە دەقەکانمدا دەبیننەوە
رووم نایەت پێیان بڵێم
باسی کەستان ناکەم
ئاە لە کەسێک دەدوێم خۆشم نازانم کێیە!

٧٩

قەت رێک نەکەوتووە
فۆتۆیەک لەگەڵ ژیاندا بگرم
هەردووکمان دڵمان بە یەکتر خۆش بێ

٨٠

رۆژێک ژیان بە دڵخۆشییەوە بانگی کردم
من لە مەراقدا گینگڵم ئەدا
رۆژێکی تر من بە دڵخۆشییەوە
بانگی ژیانم کرد
ئەو شەلاڵی ئافات ببوو

٨١

بە زەڕبین گەڕایت بە دوای نەنگییەکدا
خۆشبەختانە هەڵەیەکی بچووکت
لەسەرم دۆزییەوە و ئیتر
هەموو جوانییەکانت سڕیمەوە

٨٢

کە مردم پەیکەرم بۆ دروست مەکەن
رقم لە رەقهەلاتنە
نامەوێت دڵی ئاوریشمیم
ببێتە تەنێکی رەق

٨٣

دره‌ختێکی پیرم
هەزاران ساڵە چرۆم دەر نەکردووە
کەس منی بە سەوزیی نەدیوە
نازانم ئیتر بوونی من چی مانایەکی هەیە؟

٨٤

باوەڕناکەم کەس هەبێت
لە داروین درۆزنتر[1]
ئەو لە بری ئەوەی
ڕەچەڵەکی مرۆڤ بباتەوە سەر گورگ
گەڕاندییەوە بۆ مەیمون

٨٥

جاران دەیانووت
«لە پشت هەر پیاوێکی سەرکەوتووەوە
ئافرەتێک هەیە»
ئەی بۆ ڕەوا نییە بڵێین
لە پشت هەر عەشقێکی ناکامەوە
ژنێکی دڵڕەق هەیە؟

---

[1] ئاماژدیە بۆ چالز داروین ١٨٠٩-١٨٨٢ زانای میژووی سروشت و دانەری پەرتوکی "بنەردتی چەشنەکان". ئەو بە پیی تیۆری پەردسەندنەکەی گریمانەی ئەوەی خستە روو مروڤ لە مەیمونەود پەرەیسەندوود.

٨٦

دێونیسیۆس[1]

لە رۆحما تەمبور دەژەنێ
هەر چۆنێک بیژەنێت
رەگەزێکی دەچێتەوە سەر غەم

٨٧

من نە لە شوێندا دەمێنمەوە
نە لە کاتدا
مشتێ یادەوەرییم
لە خانەکانی مێشکتدا

٨٨

خۆشییەکی مردن ئەوەیە
چیتر هەواڵی دنیات پێناگات
دوای مردنم
گەر شەوێک هاتمە خەونت
هەواڵی ئێرەم پێ رامەگەیەنە
بە نەرمی ماچم بکە

---

[1] دیونیسیوس، لە میتولوژیای گریکیدا خودای موزیکە.

٨٩

له زەمەنێکی دوورەوە هاتووم
له بیرم دێت
کە لافاوی جەهل جەمال عیرفانی برد[١]
کاغەزم بۆ سائیب[٢] ریز دەکرد
کە «له خەوما»[٣]ی دەنووسی

٩٠

هیچتان له ژیان نەگەیشتوون
منیش وەک ئێوە له ژیان تێناگەم
ئێمە هەموومان پێکەوە
له ژیان تێناگەین

---

[١] جەمال عیرفان ١٨٨١-١٩٢٢ یەکەم ڕووناکبیری تیرورکراوی کوردە کە دژ بە خورافە و چەقبەستوویی ئاینیی خەباتی دەستپێکرد و لەو پیناوەشدا گیانی بەختکرد.

[٢] جەمیل سائیب ١٨٨٧-١٩٥١ چیروکنووس و روژنامەوانی ناسراوی کورد، سەرنووسەری هەردوو روژنامەی «پیشکەوتن» و «ژین». خوشکەزای پیرەمیرد.

[٣]«له خەوما» چیرۆکیکی هونەریی «جەمیل سائیب»ە کە بە یەکەمین چیرۆکی کوردیی دادەنریت. له سالی ١٩٢٥ بو رەخنەگرتن له حکومداریی شیخی حەفید نوسیویەتی.

٩١

ڕەنگە تێبینیتان کردبێ
زۆر باسی ژیان و مەرگ دەکەم
مەگەر شتێکی تر هەیە
لە دەرەوەی ئەو دووانە؟

٩٢

مارکس دەیووت
«خوێندنەوەی دنیا بەسە
کاتی گۆڕینێتی»
مارکس زیندوو بێتەوە
نازانێ مۆبایل بەکاربهێنێت!
بۆیە هێشتا دەبێت
لە خوێندنەوەی دنیا بەردەوام بین

٩٣

دوو هاوڕێی نوێم پەیدا کردووە
دوو هاوڕێی پێچەوانەی یەکتر
من ئەوان دەناسم
وەلێ ئەوان من ناناسن
ئۆنفرێ[١] و یوڤاڵ هەراری[٢]

[١] میشیل ئونفری، فەیلەسوفێکی هاوچەرخی فەرەنسییە، ئەبیکۆریستیکی نوییە.
[٢] یوڤال نوح هەراری، هزرمەندێکی هاوچەرخی ئیسرائیلی ناسراوە و هێشتا لە کتێبێکی رادەمێنم.

٩٤

وا هەست دەکەم
لەوسەری ژیانەوە هاتبێتمەوە
نە رووداوی تازە دەبینم
نە هەست بە ئایندە دەکەم

٩٥

مرۆڤ بە پەیژەی زانستدا سەردەکەوێ
هەر سەردەکەوێ و سەردەکەوێ
تا لە تاریکییدا نقوم دەبێ

٩٦

کات وەهمێکە
زەمەن بوونی نییە
رابردوو و داهاتوو
دوو هەڵەی زمانەوانین

٩٧

بێدەنگبوون تاوانە
تەنها من بووم لەو سەردەمەی
دار و دیوار ببوون بە گوێ
دەنگم هەڵبڕی

٩٨

ماشێنی خەیاڵەکانی ئێستا
بۆ هەر کوێ دەمبات
ناگاتە ئەو جێگایەی
خەونەکانی منداڵی دەیبردم

٩٩

ژیان لە زینداندا بەرینترە
نەک زیندان لەناو ژیاندا
دڵ لە ناو چەقۆدا ئاسانترە
نەک چەقۆیەک لەناو دڵدا

١٠٠

ئای چ ئەفسونێکە
ژیان بەو کورتییە
غەمیش بەو درێژییە

١٠١

هیچ کەسێک
هێندەی خاوەنی ئەم رستەیە
«بە درێژایی تەمەن چاوەڕێت بووم»
زووتر جێی نەهێشتم!

١٠٢

کە سەیری دەستنووسەکانم دەکەمەوە
ئەوانەی دوو دەیە و نیوە فەرامۆشم کردوون
دەمێک پێدەکەنم
دەمێک دەگریم
بۆ ئەو سادەییەی ئەوسام

١٠٣

هۆکاری ئەوەی تا ئێستا
خۆم پاراستووە لەوەی تیرۆر بکرێم
بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە
نامەوێت دوای خۆم
کەس نان و پیازی سیاسیم پێوە بخوا

١٠٤

هەندێ بەهۆی شیعرەوە
خۆشیانویستم
هەندێ بە هۆی رووخسارەوە
خۆشیاندەویم
کەس لەبەر خۆم
خۆشی نەویستووم!

ئۆکتۆبەری ٢٠١٦ تا نۆڤەمبەری ٢٠٢٠
ئازاری ئەو رۆژانەی چاوەڕێی مەرگی خۆم بووم، ئەم دێڕانەی پێ یاداشت کردم. سوپاس بۆ ئەو ئازارانەی مامانی ئەم وشانە بوون، ئەگینا مەرگ زیندەبەچاڵی دەکردم.

١

زۆر کەس گۆرانی
بۆ هەقیقەت دەڵێن
بەڵام هیچیان
بەو میلۆدییە خۆشەی من نایڵێن

٢

خنکانت پیرۆز بێت
ئەی دەریا
لێڵبوونت پیرۆز بێت
ئەی عەشق

٣

کە دەنووسم نیشتمان
دەستوخەتم زۆر جوانە
کە دەنووسم تاراوگە
دەستم ئەلەرزێ و
خەتم خوار ئەبێتەوە

٤

غوربەت
نوسراوێکی سەر چەرمە و
بە خەتی بزماریی نووسراوە
هەرچەند دەکەم
بە چاویلکەی نیشتمان
بۆم ناخوێندرێتەوە

٥

نامەی دووەمم
گەرموگوڕتر بوو
لە نامەی یەکەم
کەچی تۆ
خەیاڵت هەر لای یەکەمین نامەیە

٦

درێژدادڕیی ناکەم
نەخێر بە کورتی دەیبڕمەوە
هێندەی دووریم لە ژیان
لە مەرگ نزیکم
وا بزانم زۆر درێژ بوو!

٧

باوەشم کردووە بە ئازارەکانما
ئەویش توند توند
دەمگوشێ بە خۆیەوە
گوێم لە خرمە خرمێکە
پێدەچێت ئێسقانەکانم بن

٨

ژنێک دڵی شکاندم
ژنگەلێک هاتن بۆ سارێژکردنی
نازانم چۆن تێیان بگەیەنم
هەموو شتەکانم لای خۆمن
تەنها دڵم لای ئەو جێماوە

٩

تەنها شێتەکان
بە زمانی پەتی دڵ قسە دەکەن
ئەوان سەریان
لەم هەموو کەین و بەینەی عەقڵ دەرناچێ

١٠

شتێک لەناخی مرۆڤدا تۆپیوە
گومان دەکەم دڵ بێ
ئەگەر تا ئێستا مابێتی

١١

ئەم سەر زەوییە
هەموو شتێکی بە پێرفێکتی تێدایە
تەنها لە شتێکی کەمە
مرۆڤ

١٢

رەنگە چەند ساڵێکی تر
کەس خاوەنی خەونێکی خۆی نەبێت
وای لە دەست تەکنۆلۆژیا

١٣

بەوەی باشە
تا ئێستا تەکنۆلۆژیا
دەستی نەگەیشتۆتە خەیاڵ
ئەگینا سێ بەشی مرۆڤایەتی
ئابڕووی دەچوو

١٤

کۆمیدیاکە ئەوەیە
مرۆڤ بە بەلەمێکی تەختەوە
دەیەوێت
زەریای ئاگر ببڕێت!

١٥

هەزاران ساڵە
مرۆڤ ئەم رستەیە دەڵێتەوە
«جاران خۆشتر بوو»
ئەرێ ئەو «جاران»ە کەی بوو؟

١٦

جوانترین مرۆڤ ئەوەیانە
عەشقێک لە دەستدەدات و
جارێکی تریش
عاشق دەبێتەوە

١٧

دنیا هیچ و پووچە
رەنگە رەخنەی زۆرتان هەبێ لەم دەربڕینە
بەڵام ئەوەی کەی کێشەی ئێوەیە؟
ئەمە مەراقنامەی پیاوێکی سوریالییە

١٨

گەر خۆشت بوێم
هانا بۆ نووسین دەبەم
گەر خۆشت نەوێم
هەر پەنا بۆ نووسین دەبەم

١٩

زۆر سەرقاڵ بووم
بە خوێندنەوەی لەپی دەستی بێهودەیی
دواتر تێگەیشتم
کارەکەم چەند بێهودە بوو

٢٠

ئێستا هێندەی بیر

لە ئەوینی ژنێک دەکەمەوە

کاتم نەماوە

بۆ بیرکردنەوە لە زامەکانی پیاوێک

کە خۆمم

٢١

شاعیرەکان

هەریەکەو ئازارێکیان هەیە

کەسیان لە شادیدا نەبوون بە شاعیر

پێم سەیرە

گەر دەقی گەشبینانە بنووسن

٢٢

نامەیەکی «مارکس»م پێگەیشتووە

باس لەوە دەکات

هێندەی «لینین» دەگەی لێداوە

نیو ئەوەندە «نیتچە» ناوی نەزڕاندووە

٢٣

له وانەی جیۆگرافیدا
«با»ی باکوور و باشووری رۆژهەلاتمان دەخوێند
هیچ کات نەمدەزانی
هیچ «با»یەک
له «با»ی باکووری رۆژئاوا خوێن تاڵتر نییە!

٢٤

هێندە ماندوو بووم
بە دەست ژیانەوە
خۆزگە کەسێکم دەست دەکەوت
گلاسێک حەوانەوەم بۆ رابگری

٢٥

خوێندنەوەی ژیان
له خوێندنەوەی رۆژنامەیەک
له ژوورێکی نوتەکدا دژوارترە

٢٦

سەرەتا کاڵاکان

ساختە دەکران

ئێستا لەبەر جەشاماتی مرۆڤی ساختە

بە زەحمەت مرۆڤێکی رەسەنت

بۆ دەدۆزرێتەوە

٢٧

گەیشتووینەتە سەردەمێک

کتێبی خەوننامە

چیتر کەڵکی نەماوە

هەموو خەونەکان تاقی کرانەوە

خەونێک نەماوە بۆ بینین

٢٨

جاران بە کۆڵانەکانی فیتیادا[١]

رێم دەکرد و بیرم دەکردەوە

لەسەد مەتر دووجادا

سێ کۆندۆمی فڕێدراوم دەبینی

وەلێ ئێستا لە سەد مەتردا

سێ دانە ماسکی بەکارهاتوو دەبینم

[١] فیتیا: گەڕەکێکی ستۆکهۆڵمە و هەمیشە هەست بە شلۆقیی دەکرێت لەم گەڕەکەدا.

## ٢٩

شەوێکی تەزیو لە بانهۆڤی[١] هامبۆرگ[٢]
لەناو ئەلکهولییەکاندا ڕۆژم کردەوە
زۆر لە هەواڵی «هایدگەر»م پرسی[٣]
لەو شارە گەورەدا
جگە لە سەرخۆشێک کەسی تر نەیدەناسی

## ٣٠

کە وەڕس دەبم
دەچم شیعرەکانی پۆڵ ئێلوار[٤] دەخوێنمەوە
کە لەویش بێزاربووم
گوێ بۆ پارچە موزیکێکی شۆپان[٥] دەگرم
کە لەمیش تاقەتم چوو
پەنا بۆ خۆنووسینەوە دەبەم

---

[١] بانهۆڤ: ویستگەی شەمەندەفەر.
[٢] هامبۆرگ شارێکی باکووری ئەڵمانیایە لە تەنیشت دەریادا هەڵکەوتووە.
[٣] ئاماژەیە بۆ فەیلەسوفی ئەڵمانی مارتن هایدگەر ١٨٨٩-١٩٧٦.
[٤] پۆڵ ئێلوار ١٨٩٥-١٩٥٢ شاعیری چەپ و سوریالیستی فەرەنسییە.
[٥] فریدریش شۆپان ١٨١٠-١٨٤٩ گەورە مۆسیقاری پۆڵەندیی و جیهانییە.

٣١

ئارامم لێ بڕاوە

هێندە ژانم هەیە

سەیرە کە باسی ئازار دەکەم

بۆ برینێک دەگەڕێن لە جەستەمدا!

من برینێکم هەیە لە ڕۆحدا

٣٢

بە ڕێگایەکی دژواردا هاتم

هەموو شوێن پێکانی خۆم سڕییەوە

باوەڕ ناکەم

کەس هەبێت بە شوێن پێکانما بێت و

هەڵنەدێرێت

٣٣

دەمەوێت وەک جگەرەکێشان

وەک خواردنەوەی ئالکهول

عەشقیش تەرک بکەم

بەڵام لە خۆم ڕانابینم

٣٤

لەم هاوکێشەیە تێناگەم
هەموو شادییە گەورەکان
لای مرۆڤە بچووکەکان
کۆبوونەتەوە!!

٣٥

هیچ مرۆڤێکی گەورە
لە ئارادا نییە
بێ غەمگینیی گەورە
وەک ئەوەی غەم پاڵ بنێ بە مرۆڤەوە
بە قادرمەی گەورەییدا سەرکەوێ

٣٦

گوێ لە گۆرانی رەفیق چالاک[1] دەگرم
هەر دەڵێی
گوێم بۆ ئایەتەکانی گریان گرتووە
هێندە فرمێسکی نوستالژیا دەبارێنێ
لە ژێریدا دەخوسێم

[1] رەفیق چالاک ١٩٢٣-١٩٧٣ گۆرانیبێژ و شانۆکاری کورد.لانیکەم هەفتەی جارێک گوێ لە گۆرانییەکانی دەگرم بە تایبەتی "دوو ئاوانەکەی شوێن ماڵە گەورە..." کە شیعرەکەی هی پیرەمێردە.

٣٧

چەند زوو تێپەڕی
خەوتن لەسەر سیسەمی نیشتمان
چەند سەختە ئەم غوربەتە
ڕۆژێکی بە هەزار ساڵ دەڕوات

٣٨

لەسەر کوپی قاوە و
لە روومەتی یەخچاڵەکە
لە لێوی قازانەکان
لەسەر دڵی هەموو کەلوپەلەکان
نووسیومە نیشتمان
تەنێ لەسەر ئەو جگەرەیە
نووسیومە غوربەت
ڕۆژانە وەک ژیانی خۆم
دەبێتە سووتوو

٣٩

ئەو ئێستایانەی من دەیانڵێم
تەنها لای خۆم ئێستان
تا دەگەنە لای تۆ
دەبن بە رابردوو

٤٠

ژیاندۆستی ئەوە نییە
بیر لە مردن نەکەینەوە
چون مەرگ بیر لە هەمووان دەکاتەوە و
شتاقمان نابوێرێ لە خۆی

٤١

ئەرێ خودا ماندوو نەبوو
لە خەڵقکردنی مرۆڤ؟
بۆ پشوودان بە خۆی و گەردوون
ماوەیەک دەست هەڵگرێ باشترە

٤٢

مارکس زۆر بەدبەخت بوو
هەموو ژیانی بۆ بەرگریی
لە هەژاران دانا
هەژارانیش هەموو هەوڵیان
بۆ دەمکوتکردنی تەرخان کرد

٤٣

تالیس[1]

له دوورگەکاندا ژیانی بەسەر برد
لەبەرئەوە وتی
سەرچاوەی هەموو شت ئاوە
گەر لە بیابانیکدا لە دایک بووبا
دڵنیام سەرچاوەی هەموو شتی
دەگەڕاندەوە بۆ لم

٤٤

هەستی تۆ
تەنیا یەک پەرداخ دەگریت
من بە تەمام «راین»[2] برێژمە ناوی
ئای چ کارێکی گەوجانەیە

---

[1] تالیس 546-624 پیش زایین. فەیلەسوفی قوتابخانەی ئایونی و یەکێک لە حەوت دانا بەناوبانگەکەی گریکلاندی دیرین. ئەو سەرچاوەی هەموو شتەکانی دەگەڕاندەوە بو ئاو.

[2] مەبەست لە رووباری «راین»ە. من هەمیشە ئەو رووبارەم خۆش دەویت چونکە بەپیچەوانەی باوەوە ریگا دەبڕیت.

٤٥

ڕەنگە نەتوانم
ڕاڤەی قسەی زۆرینەی خەڵک بکەم
کەچی وەرگێڕێکی زۆرزانم
دەتوانم هەموو جۆرە بێدەنگییەک
تەرجەمە بکەم

٤٦

لە مۆزەی لۆڤەر
مێژوو سەیری دەکردم
پادشا مۆمیاکراوەکان
هیچیان نەمابووەوە
جگە لە چەند پارچە چەرمێکی ڕزیو

٤٧

شاربەدەرکردنم
لە دەرپەڕاندنی ئادەم لە بەهەشت
بە سوێترە
هەردووکمان «حەوا»یەک و
سەرکێشییەکمان هەبوو

٤٨

هەرچەند سەردەهێنم و دەیبەم
ئەو گرێکوێرەم بۆ ناکرێتەوە
بۆچی لە بری سیسرک
«سامسا»[١] پیرە جرجێک نەبوو؟

٤٩

پێم دەڵێن لە کوێوە هاتوویت؟
زمانم تەتەڵە دەکات
رەنگە لە کونی دەرزی پەژارە و
لە درزی خەونێکی زڕاوەوە هاتبم

٥٠

خۆم ژیانم کردووە بە مەخسەرە
ئەگەرنا برین و چەرمەسەرییە
ئەوە هەموو هونەرەکەی منە

٥١

لە تاراوگە جێگیربوون بوونی نییە
هەمیشە جۆلانەی غوربەت
ئەمسەر و ئەوسەرت پێدەکا

[١] ئاماژەیە بۆ "سامسا"ی پاڵەوانی "مەسخ"ی کافکا. کە فەرمانبەرێکی ئاساییە رۆژێک لە خەو بێدار دەبێتەوە و شێوەی بۆ سیسرک گۆڕاوە.

٥٢

مرۆڤی نامۆ ئەوەیە
نیشتمان و دایکی لە دەست دابێ
بەڵام مرۆڤی رووخاو ئەوەیانە
مەعشوقێکی نەبێت

٥٣

خۆزگەم بەو کاتانەی
لە رێی کتێبەوە
بەناو خۆرئاوادا گەشتم دەکرد

٥٤

داپیرەم دەیگووت
هەمیشە شوێن خۆت بکەوە
ئەمە تاکە جار بوو
بە قسەی کەسێک بکەم

٥٥

کورد بە تەوسەوە دەڵێت
دەتکەم بە سینەما، دەتکەم بە فیلم
زۆر ئەترسم رۆژێک دابێت
فیلمی ژیانم بکرێتە فیلم

٥٦

هەمەنگوای

«ماڵئاوایی لە چەک»ی نووسی[1]

سەردەمەکە ئەوە دەخوازێت

بەخێرهاتنەوەی چەک بکەین

٥٧

لە قوتابخانە

رقم لە وانەی مێژوو بوو

ئاخر دەبوو دۆڕانی پادشاکان

بە سەرکەوتن لەبەر بکەین

٥٨

کوڕەکەمم بینی

لەناو لمی قوتابخانەکەیدا

گەمەی دەکرد

هەرچیم کرد

نەمتوانی بیر لە ئەنفال نەکەمەوە

---

[1] ئاماژەیە بۆ رۆمانی "ماڵئاوایی لە چەک"ی نووسەری ئەمەریکی ئارنست هەمەنگوای 1899-1961.

٥٩

ناپلیۆن[١] بە رێکەوت
بوو بە فەڕەنسی
بەڵام من بە حەزی خۆم
بووم بە کورد

٦٠

ژمارەیەک گەنجی کورد
بە یەکجاری دێن بەرەو ئەڵمانیا
ژمارەیەکی تری پیرە پیاوی کورد
بە یەکجاری دەگەڕێنەوە وڵات
کاتێک لە فڕۆکەخانەی فرانکفۆرت
پێکدەگەن
هەردوو گروپ یەکتر بە شێت دەزانن

٦١

لە ئاسایش گیرابووم
هێندە زانیارییان لەسەرم هەبوو
زۆر سوپاسم کردن
کە بە خۆمیان ناساندم

[١] تا ساڵێک پێش لە دایکبوونی، زێدی ناپلیۆن پۆناپارت "کۆرسیکا" بەشێک بوو لە ئیتاڵیا.

٦٢

لەوەتی لە شەمەندەفەری کۆچ
لە وێستگەی پەشیمانی دابەزیوم
بە دوای شتێکدا دەگەڕێم:
نیشتمان

٦٣

ملیۆنان ساڵە
مرۆڤ هەوڵ دەدات لە خۆی تێبگات
هیچ تێنەگەیشتووە و
دەیەوێ نهێنی گەردوون ئاشکرا بکا

٦٤

کە گەیشتمە سەر چیای نائومێدیی
پێدەکەنیم
کە نەهەنگی گەشبینی قووتی دام
لە پرمەی گریانم دا
نامەوێ نقوم بم لە هیچدا

٦٥

ویستم بنووسم «هیچ»
بیرم کەوتەوە
لە فەرهەنگی مەراقدا
«هیچ»یش
زۆر شت دەگرێتەوە
بەم هۆیەوە «هیچ»م نەنووسی

٦٦

ژنێک لە مندا سەما دەکات
پیاوێک لە مندا هەڕەشە دەکات
ژنێک لە مندا گۆرانی دەڵێت
پیاوێک لە مندا دەڕشێتەوە[1]

٦٧

سوغمەی ژیانم دادڕی
شیعرم لە مەمکەکانی خواردەوە
لە بری گەورەبوون
منداڵتر بوومەوە

---

[1] بەپێی تیۆری دەرونشیکاریی کارل یۆنگ، ناهۆشیاریی "لا وعی" هەر مرۆڤێک بەشێوەی دوالیزمی پێکهاتووە لە ژن و پیاو. هەموو پیاوێک بەشێکی ژنانەی هەیە کە ئەو پێی دەڵێت "ئانیما"، هەروەها هەموو ژنێک بەشێکی پیاوانەی هەیە کە بەناونانی "یۆنگ" پێی دەوترێت "ئانیمۆس".

٦٨

خەونی خۆم بچووک ناکەمەوە
خاوەنی گشت جیهانم
نەک تەنیا کوخێکی بچووک

٦٩

شۆڕشەکان درۆ دەرچوون
مودێرنێتە گوێزێکی پووچ بوو
ئاین ترۆزییەکی تاڵە
هیچیان نەیانتوانی
لە دڕندایەتی مرۆ کەم بکەنەوە

٧٠

تاکە شانازییەک هەمبێ ئەوەیە
زۆر لەوە کێویتر بووم
بە پارە ماڵیم بکەن
سوپاس رۆحە کێوییەکەم

٧١

ئەگەر دەتەوێ بڕۆیت
دەمانچەکەت بخە سەر سەرم
پەنجە بنێ
بە دوا فیشەکی بەزەییدا

٧٢

هاشا لە خۆم بکەم
لە شێتێتییەکانمی ناکەم
ئایا رازیت
شاعیرێکی شێتت خۆش بوێ؟

٧٣

هەرچی تاوانە خستیانە ئەستۆم
تۆش باوەڕت بەو سکێجە کرد
نەیاران بۆیان کێشابووم
روونکردنەوەی چی بدەم؟

٧٤

من و غەم
بە دوو قۆڵی
بە شەقامی دڵتەنگیدا هەڵدەگەڕێین
تەنیایی دەبێتە نەفەری سێهەممان

٧٥

بیست ساڵ لەمەوبەر
لە ئاوگۆستی ساڵی دوو هەزار[1]
پۆلیسەکان دایان بەسەر ماڵماندا
چەند کتێبی قاچاغیان برد
بەڵام نەیانتوانی دەست بگرن بەسەر
کتێبخانەیەکی قاچاغ لە مێشکمدا

٧٦

ئەگەر تۆ بڕۆیت
هیچم نەدۆڕاندووە
دەگەڕێمە بۆ لای هاوڕێ دێرینەکەم:
تەنهایی

[1] لە ئاوگۆستی ساڵی ٢٠٠٠ مەفرەزەیەکی پۆلیس و ئاسایشی سلێمانی، بۆ دەستگیرکردنم لەناکاو دابوویان بەسەر ماڵماندا، منی کۆمۆنیستیان دەست نەکەوتبوو چون هەزار کیلۆمەتر دوور کەوتبوومەوە، بە ناچاریی چەند کتێبێکیان لە کتێبخانەی ماڵەوە لەگەڵ خۆیاندا بردبوو کە لای ئەوان قاچاغ بوون. تراژیدیاکە ئەوە بوو یەکێک لەو کتێبە قاچاغانە نامیلکەی "کۆمیدیا"ی ئەحمەد سالار بوو.

٧٧

تەنها لاسایی خۆم کردووەتەوە
زۆر کەس دەناسم
لاساییم دەکەنەوە
خۆزگە دەیانزانی
مامۆستاکەیان چەند فاشیلە!

٧٨

شارستانییە دێرینەکان
لەوەدا لە ئێمە داناتر بوون
هیچ پەیکەرێکیان دانەتاشیوە
نیوەی ئاژەڵێکی دڕندە و
نیوەکەی تری مرۆڤ نەبێت

٧٩

مەسرەفگەرایی
فێری خوویەکی دزێوی کردووین
زۆرتر ئەو کاڵایانە دەکڕین
هەزار ساڵ بژین بە کەڵکمان نایەن

٨٠

له بەردەرکی سەرا
بە دوو عەلاگەی پرتەقاڵیی پڕ میوەوە
بە بەردەمِ کتێبفرۆشەکاندا رەت بووم
کچێکم بینی کتێبێکی منی دەکڕی
هەرچەند کۆشا باوەڕی نەدەکرد
وێنەی سەر بەرگی کتێبەکە من بم

٨١

رۆژێک دێت
رۆبۆتەکان فەرمانڕەوان
بە هۆمۆسەپیین[١] دەڵێن
مرۆڤی ساختە

٨٢

دەمویست شتێک بگێڕمەوە
لەم زەمەنەی گوێیەکان بوون بە دەم
گێڕانەوەش کەڵکی نەماوە

[١] هۆمۆسەپیین، ئەو مرۆڤە نوییەیە لە ٢٠٠ هەزار ساڵ پێش ئێستاوە سەریهەڵداوە. ئێمە نەوەی ئەوانین.

٨٣

له چەرخێکدا
کە هەموو شتێک بێهودە بووە
قەیچێکە خوو بدەینە خوێندنەوە
وەک هەر کارێکی تری بێهودە

٨٤

جوان دیقەت بدەن
بە کارە دژوار و مەحاڵەکان دەوترێت
خەیاڵی شاعیرانە!
شاعیریی زەحمەتترین کارە

٨٥

مرۆڤی نوێ
هەموو ئامانجی چێژوەرگرتنە
هیچ نەبێت
کتێب خوێندنەوەش چێژی خۆی هەیە

٨٦

کتێبەکان دەتوانن
بە زۆر کەسمان بناسێنن
هەرگیز نەماندیون

٨٧

بەرگەگرتنی رەفتاری مرۆڤ
زۆر لە خوێندنەوەی خەیاڵیان
سەختترە، زۆر سەختترە

٨٨

چۆلەکەیەک لە ئاسمان دەهاتەوە
چۆلەکەیەکی تر بەرەو ئاسمان دەفڕی
لەسەر رێگا هەواڵی یەکتریان پرسی
چۆلەکەی یەکەم وتی ئاسمان
هەمووی شوێنەواری کاولکاریی مرۆڤە
چۆلەکەی دووەم وتی
سەر زەویش بە هەمان شێوە

٨٩

دنیای ئێستا
جوانییەکان دەشارێتەوە
وەک ئەوەی باوەژنەکەی سەندرێلا[١]
فەرمانڕەوای جیهان بێت

[١] ئاماژەیە بۆ "فیونا"ی باوەژنی سەندرێلا کە سەندرێلا لە شازادە دەشارێتەوە، چونکە هەم جوانە هەم پاپوچە ئەفسوناوییەکە پڕ بە پێیەکانی ئەون.

٩٠

سەرمایەداریی بۆگەنە
هەر بە زیندوویی پارەی گۆڕت لێ دەسەنێ
لە قەبریشدا زوو زوو کاغەزت بۆ ئەنێرێ
بیرت دەخاتەوە گرێبەستەکە زۆری نەماوە

٩١

بە زمانی غەریبیی
گۆرانی دەڵێم
نیشتمان لێم تێناگات

٩٢

بە چاویلکەی غوربەت
سەیری ئەتڵەس دەکەم
نیشتمانم بۆ نادۆزرێتەوە

٩٣

بە قاچی ئاوارەیی
هەنگاو دەنێم
ناگەمەوە بە نیشتمان

٩٤

وێنەی خۆم بە تەنیا دەکێشم
تۆ لەگەڵمایت
وێنەی هەردووکمان پێکەوە دەکێشم
تۆ لەگەڵمدا نیت

٩٥

هێشتا وەڵامی ئەو پرسیارەم
وەرنەگرتبووەوە
ژیان چییە؟
گرەی مەرگ بردمی

٩٦

مرۆڤی گومانکار
هەقیقەتەکانی دنیا
بۆ مرۆڤی دڵنیا
ئاشکرا دەکات

٩٧

ئەوەی مرۆڤە مەییوەکان
دەستیان پێی ناگات
مرۆڤە ڕاڕاکان دەیدۆزنەوە

٩٨

کۆڵانەکانی فەلسەفە تەمومژاوین
لایتی شیعر نەبێت
کەس بەر پێی خۆی نابینێ

٩٩

بۆ ئەوەی هەقیقەت بناسین
دوو چاوی ترمان پێویست نییە
بە گەڕخستنی عەقڵمان گەرەکە

١٠٠

شۆڕشی فەڕەنسی[١]
رووخساری مێژووی گۆڕی
ئەویش قەرزاری
نەبوونی نان و
پێ رابواردنەکەی شاژن بوو

[١] شۆڕشی 1789ی فەڕەنسا، بە گرنگترین شۆڕشی مێژووی نزیک دادەنرێت. برسییەکان داوای نانیان دەکرد و شاژنە ماری ئەنتوانێت بە لاقرتێوە پێی گوتن مادام نانتان نییە کێک بخۆن.

١٠١

دەتوانن بە درێژایی تەمەن

لە زیندانم پەسێون

بەڵام ناتوانم بۆ یەک چرکە

لە خۆمم دابماڵن

١٠٢

خەیاڵ ناوبانگێکی خراپی هەیە

لە خۆتان پرسیوە

چی هەیە لە مێشکی خەیاڵەوە نەهاتبێ؟

١٠٣

زانست بەرهەمی خەیاڵە

نەک خەیاڵ بەرهەمی زانست

ئەمە گەورەیی خەیاڵە

١٠٤

زۆرجار دەڵێن

تۆ شاعیرێکی رەشبینیت

پرسیارەکە ئەوەیە

من جیهان بە رەش دەبینم

ئەی ئێوە چۆن؟

١٠٥

هەرچی کتێبە بێهودەیە
مادام شەرحی جیهانێک دەکەن
راڤە ناکرێ

١٠٦

بەخێرهاتنی کۆرپەکان بکەن
بۆ ناو ئەو ژیانەی
بە یەک چاو تروکاندن
کۆتایی دێت

ئاپریلی ٢٠١٥ تاکو سێپتامبەری ٢٠٢٠

ئەم دێڕانە لە ٢٠١٤ەوە لەناو ئەندێشەمدا دەهاتن و دەچوون، جار جار رێم دەدا خوێنی یەکێکیان برژێتە سەر کاغەز، ئەم چەند رۆژە ئەو کاغەزە شڕانەم کۆکردەوە و ئەمانەم بەو جۆرەی ئێستا پوخت کردنەوە.

١

ئەگەر جارێکی تر
لە دایک ببمەوە
دووبارە شیعر ئەنووسم و
عاشق نابمەوە

٢

رێ مەدە کەسی تر
هەستی تۆ بنووسێتەوە
بە زەوقی خۆی داتدەرِێژێتەوە

٣

دەمەوێت پێبکەنم
گریانێک لە ناوەوەمدا
دەست دەکات بە شیرە شیر

٤

ئەگەر بە دوای راستیی
ئەم زەمەنە تازەیەدا وێڵیت
برۆ کتێبە زۆر کۆنەکان بخوێنەوە

٥

زۆربەی موفلیسەکانی شار
رۆژێک لە رۆژان
خوێنەری ئەم کتێبانە بوون:
"چۆن دەبیتە ملیۆنێر"؟!

٦

هەتا بەناو ئەشکەوتی مێژوودا
قووڵتر رۆبچین
زۆرتر لە تاریکیی ئێستا تێدەگەین

٧

گەشبینی
بە تاڵە موویەک
هەر دوو دەستی بەستووم
رەشبینی وەک گوریسێکی ئەستوور
لە گەردنم ئاڵاوە

٨

هاتنت بۆ نێو ژیانم
هەڵەیەکی گەورە بوو
هەرچەند قەشەنگترین هەڵەشە

٩

کاتێ یەکتر ماچ دەکەین
سروشت پێدەکەنێت
هەورە بروسکە
فۆتۆمان دەگرێت
نازانم ئێستاش وەک جاران
حەزت لە وێنەگرتن نییە؟

١٠

دوو جار کاسەسەریان هەڵدڕیم
پزیشکەکان تەنیا وەرەمیان بینی
دەستیان نەگەیشت
بە گەنجینەی وشەکان

١١

تا ساڵەکان تێپەڕن
بەسەر مانەوەم لە تاراوگەدا
رەنگی غوربەت لە نێو شیعرەکانمدا
تۆختر دەبێتەوە

١٢

خۆرئاوا
ناوی خۆی بە خۆیەوەتی
ئای چ مەغریبێکە
فێی خۆکوشتن گرتوومی!

١٣

دڵنیاییم خانووەیەکی گڵە
هێندە دڵۆپەی گومان
بە ناو زگیدا هاتووەتە خوارەوە
هاکا بەسەرمدا رووخا

١٤

سەیرم دەکەیت
لە هیچ تێناگەیت
نە لە خەندە گرینۆکەکانم
نە لە ئەسرینە پێکەنیناوییەکانم

١٥

زۆر پرۆژەم سپارد بوو
بە داهاتوو
کاتێکم زانی لەناو دارەمەیتدام
بە سەرسوڕمانەوە دەمگووت
کوێڕا مردم

١٦

قەرزێکی زۆرم لای ژیانە
لە بری پێدانەوە
دەستی ناوەتە یەخەم
هەڕەشەی کوشتم لێ دەکات

١٧

مەرگ لە پڕتاو دێت
رەنگە فریای کردنەوەی قۆپچەی ژیان نەکەوین
رەنگیشە هەر ئێستا
لە حەوشەی دواوەی تەمەن
چاوەڕێمان بکات

١٨

زۆر سەیرە!

بە درێژایی رۆژ

حەز بە سەمفۆنی "تریفەی مانگ"[١] و

"شەوێکی بچووک"[٢]دەکەم

١٩

کاتێ نامەکەت گەیشت

سەرقاڵی نووسینی نامەیەک بووم

وەک دوا نامەی بەر لە خۆکوشتن

نامەکەی خۆم دڕاند

نەمزانی نامەکەی تۆ

نامەی ماڵئاواییکردنە

٢٠

دەسەڵات

حەبی خەو دەخاتە شەربەتی جەماوەرەوە

واش نەبێت

جەماوەر لەسەر هیپنۆتیزم[٣] راهاتووە

---

[١] ئاماژەیە بو سەمفونییەکی بیتهوڤن بە ناوی "تریفەی مانگ یان تیشکی مانگ".

[٢] ئاماژەیە بو سەمفونییەکی ناوداری مۆزارت بە ناوی "شەویکی بچووک "einer kleine nacht

[٣] هیپنۆتیزم: خەواندنی موگناتیسی

٢١

له بازنەیەکدایە و
هەنگاو نانێ بۆ دەرەوە
پڕ بە خۆی دەقیژێنێت
پێیوایە یاخی بووە!

٢٢

هێشتا باوکیان نەکوشتووە
تووشی گرێی ئۆدیب[١] بوون
بەڵام زۆر هۆشیارانە
سواری دایکە نیشتمان دەبن

٢٣

رۆحم هێشتا بۆنی ئۆزۆی لێدێ
پەنجەکانیشم بۆنی سیگار
دڵم بۆنی وەڕسی لێدێ
هەناسەشم بۆن سیری غوربەت
ئەوەی سەیرە شیعرەکانمن
کە بۆنی ئەوینیان لێنابڕێ!

[١] گریی ئودیب، له ئەفسانەی ئودیب پاشاوە هاتووە کە باوکی خوی دەکوژیت، بی ئەوەی پیی بزانیت لەگەل دایکی خوی هاوسەرگیریی دەکات، کاتیک بە راستییەکان دەزانیت هەردوو چاوی خوی هەلدەکولیت.

٢٤

ئەوەتەی بووم بە شووشەچی
پەنجەرەی نەگبەتیم هاڕە ناکات
ئەوەتەی بووم بە بەرگدروو
چاکەتی غەمگینیم نادڕێ

٢٥

هەرچی دەکەم
خۆمم بۆ ژێر ناکرێتەوە
ئەو کاتەی دەنووسم
خۆشم ئەوێی

٢٦

هەست دەکەم
ئەمڕۆم لە دوێنێ دەچێ
سبەینێشم لە ئەمڕۆ
ژیان قەوانێکی سواوە

٢٧

وا دەزانن مایکرۆفۆنن
پەنجە دەنێن بە دووگمەیەکدا
قسەیان پێدەکەن
کە کاریان پێیان نەما
دەیانکوژێننەوە

٢٨

بە مرۆڤێکی تێگەیشتوو
سەیرم دەکەیت
مرۆڤی تێگەیشتوو هەیە
لە خۆی تێنەگات؟

٢٩

چیتر راین و دانوب[١]
لە چاوی مندا
هێندە کوێرە کانییەکی ولات
شۆخ خۆیان نانوێنن

---

[١] دوو رووباری ناوداری ئەوروپان.

٣٠

سوێند دەخۆم بە زیۆس[١]
دوای تۆ
دەستنوێژ لە هەرچی ژنی دنیایە
نەشۆمەوە

٣١

کەیفی خۆتانە چۆنم دەبینن
مرۆڤێکی چەپم
هەرگیز راست نابمەوە

٣٢

پاش ئەو هەموو ئارەزووە
دوای ئەو هەموو پیاهەڵدانە
بە بەژنی زراڤی نیشتماندا
دەترسم لە غەریبستان بمرم

٣٣

کە رۆیشتم بۆ هەندەران
جانتاکەم پڕ بوو لە بۆنی نیشتمان
کە لە هەندەرانەوە هاتمەوە
جانتاکەم تەژی بوو لە بۆنی غوربەت

[١] زیوس لە ئەفسانەی گریکیدا خوای گشت خواکانە

٣٤

پێش جەنگ
لەسەر قۆڵی باوکی دەخەوت
دوای جەنگ
لەسەر شۆستەی شار

٣٥

لە دەرگای ژیان دەدەم
خۆی لە ماڵ نییە
مردن دەیکاتەوە

٣٦

مرۆڤ گەمژەیە
کاتێ باسی دۆزەخی بۆ دەکەیت
لە بری سەیری ناخی خۆی
چاو بۆ ئاسمان هەڵدەبڕێ

٣٧

ویستم رۆمانێک
بە شێوەی خەیاڵی زانستی بنووسم
زانست هیچی لە خەیاڵ
نەهێشتووەتەوە بۆ نووسین

٣٨

مرۆڤە خۆکوژەکان
دوو جۆرن
ئازای ترسنۆک و
ترسنۆکی ئازا

٣٩

ژیان هێندە تاڵە
ئەگەر مردنیش نەمێنێت
زۆرێک هەن
هەوڵی خۆکوشتن بدەن

٤٠

مانگ
بەهۆی ئەنانیەتی خۆیەوە
بەر پێی رووناک دەکاتەوە
هەموو شتێکی تر لە گەردووندا
هەروایە

٤١

بە گێڕانەوەی حکایەتەکانی دوێنێ
ئەمڕۆ رازی دەکەین
ئەی سبەی چی؟

٤٢

هەست بە تێپەڕینی کات ناکەم
تەنیا لە شاشەی ئەو شەمەندەفەرەوە
سەیری مێژوو دەکەم
لە بیلەفێلدەوە تا کۆیلن دەمبات

٤٣

راگرتنی مرۆڤ لە دڕندەیی
وەک سەپاندنی یاساکانی هاتوچۆیە
بەسەر مێروولەکاندا

٤٤

راین[١] دەمبات بۆ پیاسە
راین دەبەم بۆ پیاسە
جارێک ئەو لەگەڵ من
بەرەو خوارەوە دێت
جارێکی تر من لەگەڵ ئەو
بەرەو سەرەوە دەڕۆم

٤٥

دەمەوێت بڕۆم بۆ دوبلن[٢]
تەنیا پیاوێک دەناسم لەوێ
ناوی جیمس جوێسە[٣]
زۆر دەمێکە باسی دوبلنییەکانم بۆ دەکات[٤]

٤٦

کە لە کوردستان بووم
تا کتێبێکم دەخوێندەوە

١ راین، ئەو رووبارەیە لە خوارەوە بۆ سەرەوە دەڕوات، من هەمیشە لە شاری کویلن ئەوم دیوە.
٢ دوبلن پایتەختی ئیرلەندا.
٣ جیمس جوێس 1882-1941 نووسەرێکی بەناميێ ئیرلەندییە.
٤ دوبلنییەکان ناوی کۆمەڵە چیرۆکێکی جوێسە، کە پێکهاتووە لە پانزە چیرۆک.

پانزەی ترم دەکڕی
ئەوەتەی لەم بیابانی سەهۆڵەم
تا کتێبێک دەکڕم
سەد دەخوێنمەوە

٤٧

بە منداڵی حەزم دەکرد بفڕم
ئەستێرەکان کۆبکەمەوە و
بیانخەمە زەمبیلەیەکەوە
کە هاتمەوە سەر زەوی
بیانکەمە ملوانکە بۆ دایکم

٤٨

دایکم
ژنێکی یاخی بوو
هەرگیز نەمبینی
بە دڵی باوکم بجوڵێتەوە

٤٩

لەوانەیە مەرگی دایکم
زۆری نەگریاندبم
دەمەویست بۆ خۆی بگریم
نەک بۆ خۆم

٥٠

نە لەگەڵ کەس پێکەنیوم
نە لەگەڵ کەس گریاوم
هەموو جار بە تەنیا
پێکەنیوم و گریاویشم

٥١

سەری شۆڕ کردووەتەوە
بەسەر کتێبێکدا
بەڵام کتێبەکە بۆ ئازادیی
سەری پێ هەڵبڕی

٥٢

کاتێک هاوڕێکانم لێم تەکینەوە
دڵنیابوومەوە
لە ڕۆحی یاخیبووی خۆم

٥٣

مرۆڤ
لەگەڵ هیچ بوونەوەرێ
دانوی ناکوڵێت
تەنانەت لەگەڵ هیچیاندا
ناخرێتە رستەوە

٥٤

قەفەس هەر قەفەسە
لە ئەڵماس دروست کرابێت
یان لە تەنەکە

٥٥

مرۆڤی دۆڕاو
دوێنێ دەلاوێنێتەوە
مرۆڤی خەوخۆش، سبەی
مرۆڤی راستەقینەش
هەموو هۆشی لای ئێستایە

٥٦

هەمووتان بە وشە نەرمەکان
خەسێنراون
تەنیا منم بە زمانە زبرەکەم
راتاندەچڵەکێنم

٥٧

ترسم لە نووسین هەیە
دەترسم، زۆریش دەترسم
نووسین هەوانتە نییە

٥٨

لەبەرئەوەی عاشقم
یان بەهۆی ئەوەی شۆڕشگێڕ نیم
بەردەوام مەی دەخۆمەوە

٥٩

ئەوەندە دەزانم
چێژ لە بێ هیوایی وەردەگرم
هیواکانی ئێمە ئەوەندە بچووکن
ئومێدت نەبێت باشترە

٦٠

ژنێک نییە
رابردوو و ئێستا و داهاتووم
پێکەوە گرێ بدات

٦١

سەعات حەڤدەیە
من و خۆر پێکەوە ئاوا دەبین
ئەو بەیانی دێتەوە
منیش بەڵێنی هاتنەوە نادەم
بۆ سبەی

٦٢

پیرێ بەفرێکی باش باری
هەموو دنیای لە رەنگی سپی هەڵکێشا
تەنیا رۆحی من لە رەشاییدا مابووەوە
ئاە خودا چەند رەشبینم

٦٣

ژیان بە پەلە رێ دەبڕێ
مەرگ لەو خێراتر بەڕێوەیە
وەک دوو ئۆتۆمبیل
لە مندا بە یەکدادەکێشن

٦٤

م ر د ن
چوار پیتە
ملیارەها مرۆڤی تۆقاندووە

٦٥

مەرگ
بە بەراورد بە ژیان
بە حەفتا ئاو شۆراوەتەوە
ئای لە دژواریی ژیان

٦٦

کاتێکی زۆری ویست
تا تەنهایی
وەک نزیکترین برادەر قبوڵ بکەم

٦٧

من و بێدەنگی هاوڕێین
هیچمان نە گلەیی لە یەکتر دەکەین
نە لەگەڵ یەکدی دەدوێین

٦٨

هیچ کات بێزار نیم لە تەنهایی
چون هەمیشە لە تەنیاییدا
لەگەڵ خۆمم

٦٩

لە دوسلدورفەوە تا تاران
لەناو فڕۆکەیەکی ئێرانیدا
لە بری شیعرەکانی
بیرم لە عەشقی شاملۆ و ئایدا دەکردەوە[1]

[1] هێمایە بۆ شاعیری ئێرانی "ئەحمەدی شاملو" و خۆشەویستەکەی "ئایدا".

٧٠

مەراقێکی زەنگینم
لە جیهانێکی هەژاردا
ئەمە نهێنییە مەزنەکەمە

٧١

کە داوام لێ دەکەن
لەسەر فلان بابەت شیعرێک بنووسم
نەک شیعر
ئەبجەدیاتیشم بیر دەچێتەوە

٧٢

هەر لە دەقدا خۆم دەکوژم
هەر لە دەقدا خەمۆکم
هەر لە دەقیشدا دەژیم

٧٣

هێندە تووڕەم
دەمەوێت پیسترین جنێو بدەم
هەرچەند ورد دەبمەوە
جنێوێکی کوردیی نادۆزمەوە
سێکسوالیتی نەبێت

٧٤

ئەی مرۆڤ
تۆ خاوەنی گەردوون نیت
جوان لە خۆت بڕوانە
بەکتریایەکی زەبەلاحی

٧٥

چاوەڕوانی فریادڕەس مەبە
ئەگەر بتەوێ بە تەنها خۆت
دەتوانی فریای خۆت بکەویت

٧٦

تێزە رەشبینەکانم
زۆرتر ئیرۆسین[١]
چەمکە گەشبینەکانتان
زۆر ساناتۆسین[٢]

---

[١] ئیروس، لە میتولوژیای گریکیدا خواوەندی ئەڤینداریی و جوانی و سێکس و ژیانەوەیە.
[٢] ساناتوس. لە ئەفسانەی گریکیدا خواوەندی مەرگ و کابووس و ئافاتە.

٧٧

دوو خوشک و سێ برام هەیە
خوشکەکانم ناویان
گەشبینی و ژیانە
براکانیشم ناویان
نائومێدیی و پووچی و دڵشکانە

٧٨

لە خۆپیشاندانێکدا گیرام
فڕێیاندامە ناو زیندانێکەوە
کە پڕ بوو لە پیاوخراپ
دوای نیو کاتژمێر بۆم دەرکەوت
کەسیان لەوانە خراپتر نین گرتیانم

٧٩

ئێستاش نازانم
ئەو ئازایەتییەم لە کوێ هێنا
پێش بیست ساڵ
جرتم بۆ وەزیرێک لێدا؟[1]

---

[1] لە بەهاری 1998 لە کۆبوونەوەیەکی خوێندکارییدا جرتم بۆ وەزیری پەروەردە لێدا. کە ئەو دەم ئەمە خەتەرناکترین کار بوو. دواتر کچێکی ئەو وەزیرە بوو بە نزیکترین هاوڕێم، منیش ئەم چیرۆکەم هەرگیز بۆ باس نەکرد.

٨٠

مرۆڤ خەریکە ژێر دەبێت
لەبەرئەوەی چیدی
چاوەڕوانی گۆدۆ[١] ناکات

٨١

سەرەتا حەزم بە دەرکەوتن هەبوو
هێندە دەرکەوتم
کێشەکەم ئەمەیە
نازانم لە کوێ خۆم بشارمەوە؟

٨٢

دەمەوێت شتێک بڵێم
چل و ئەونە ساڵە
ئەمەوێ هەر ئەو قسەیە بکەم
هێشتاش ناتوانم دەریبڕم

٨٣

گەر ئەتانەوێت
مێژووی ئێش بنووسنەوە
وەرن بیۆگرافیای من بنووسنەوە

---

[١] هێمایە بۆ شانۆنامەی "لە چاوەڕوانی گۆدۆدا"ی "سامۆئێل بێکێت".

٨٤

چاوەڕوانیم زۆر لێت هەبوو
بۆ نموونە دەمویست
لە بری چاوەکانم
لێوەکانم تەڕ بکەیت

٨٥

چل ساڵ زیاترە
لەم قەپاغە گۆشتییەدام
هیچ ناگۆڕێت
ناگۆڕێم بە هیچ

٨٦

شەوێک لە پاریس
خەونم بە وڵاتەوە دەبینی
لە پڕا بێداربوومەوە
بە فرمێسکەوە لە خۆم پرسی
من چی دەکەم لێرە؟

٨٧

من رقم لە خۆم هەستاوە
خۆم رقی لە من هەستاوە
دەستمان ناوەتە یەخەی یەکتر
تا مردن رقەبرایەتی دەکەین

٨٨

ئەگەر لە ژیان دڕدۆنگی
بێ دەنگە دەنگ خۆت بکوژە
تەنیا با ناڵەی ئەو فیشەکە بێت
مێشکت دەپژێنێت

٨٩

دیکات دەیگووت
"من بیر دەکەمەوە، کەواتە من هەم"
بە لەسەرخۆییەوە دەڵێم
من عاشقم کەواتە من نیم

٩٠

هەتا هیگل[١] پێداگریی لەوە بکات
هۆڵدەرلین[٢] کۆمەکی روانینی کردووە
ئەستێرەی شیعر ئەدرەوشێتەوە

---

[١] فریدریش هیگل 1831-1770 یەکێک لە ناسراوترین فەیلەسوفی دنیایە.
[٢] یوهان فریدریش هولدەرلین 1843-1770 شاعیری ئەلمانی و هاو کلاسی قوتابخانەی هیگل.

٩١

دەبێت پێ بە جەرگی خۆماندا بنێین
بە راشکاویی بڵێین
کۆتایی هەموو یۆتۆپیایەک
دیسپۆتیایە

٩٢

گەردەلولێکی شاراوە
لە ناخمدایە
وای لەو رۆژەی خۆی دەردەخا

٩٣

بە غەمگینی ماچت ئەکەم
تەڕیی ماچەکانم
بۆ ئەبەد بە لێوەکانتەوە دەمێننەوە

٩٤

حەزەکەم بڕژێمە
پیاڵەی ئارەزووتەوە
بمخۆرەوە وەک پێکێکی شیرین
یان وەک چایەکی تاڵ

٩٥

زۆرجار زریانی ماچم
هەندێ جار رەشەبای حەز
زۆر جار بارانێکی هێمن
هەندێ جار دەریایەکی شەپۆلاویی
زۆر جاری تریش
گۆمی مەندی خۆشەویستی
من لە یەک کاتدا هەموویانم

٩٦

گۆرانی بۆ سروشت دەڵێم
بۆ ئەو پەڵە هەورانەی بەسەرمانەوەن
کە تۆزێکی تر دەست دەکەن بە گریان
فرمێسکەکانیان بەسەر دار و درەختدا ئەبارێن
ئەوانیش چرۆی تازەی پێ دەردەکەن
ئەمەش عەشقم بیر دەخاتە

٩٧

لە نێو رۆحمدا
نم نم تۆ دەبارێی

لە ناو دەستی مندا
مەمکت ئەبارێ
لەسەر لێوی من
شەکرە ماچت ئەبارێ
ئای لەو هەموو بارانەی نێو خەیاڵ

٩٨

رۆحم لە نیشتمان جێما
دڵیشم لای تۆ
ببینە چەند رووت و رەجاڵم

٩٩

هەر ئەوەندە خوێنەواریم هەیە
لە کۆتایی هەموو نامەیەکدا
وەک سەرەتای هەر نامەیەک
بنووسم: خۆشم ئەوێی

١٠٠

پاڵەوانی چیرۆکێک بووم
نووسەرەکە دەیویست
شەڕی عەشقم پێ بکات
نەموێرا و رامکرد
ئێستا لە شیعرێکی بێ ئومێددا
خۆم شاردووەتەوە

١٠١

مامۆستای ماتماتیک
باسی ئەوەی دەکرد
ژمارەکان کۆتاییان نایەت
وامزانی باس
لە بەدبەختییەکانی من دەکا

هاوینی ٢٠١١ تاکو بەهاری ٢٠٢١

١

کوڕی نیشتمانی گریان
شاری حوزن
گەڕەکی بێتاقەتی
کۆڵانی ئەسرینم
هەمیشەش پێدەکەنم

٢

داوای ئاشتی لە ژیان دەکەم
ئەوەتا نابینن
چۆن هەڕەشەم لێ دەکات؟!

٣

کچێک خۆشی دەوێم
من نایناسم
ژنێکم خۆش دەوێ
ئەو من ناناسێ

٤

خۆم بە تەنهاییدا هەڵواسیوە
تەنهایی خۆی بە مندا هەڵواسیوە
ئەم یارییە تا کۆتایی بەردەوام دەبێ

٥

قەت بە خۆم نەگووتووە
چاکەخواز
لەبەرئەوەی مرۆڤم

٦

ئاوێنەکەم سڕییەوە
لە بری خۆم تۆم بینی
ئاوێنەکەم شکاند
لە بری تۆ خۆم بینی

٧

پێت گووتم
بڕۆ تەمبوری تەنهایی بژەنە
تەمبوری تەنهاییم دەژەنی
بە پەشیمانی هاتیتەوە بۆ لام

٨

به مەزندەی خۆمان
هەنگاومان دەنا بۆ داهاتوو
کەوتینە چاڵی رابردووەوە

٩

چەند تاڵە
خەیاڵێکی مەلۆتکە بیت
لە ژێر زوقمی رۆژگاردا
رەق بیتەوە!

١٠

من خاوەنی شیعرە چاو تەڕەکانم
تۆش چیرۆکە لێو بە بزەکان
من خاوەنی هیچم
تۆش خاوەنی هەموو شت

١١

لەشی گەرمت گەرمم دەکاتەوە
لەشی ساردت گەرمم دەکاتەوە
هەر چۆن لەشت بەر لەشم بکەوێ
پێی دادەگیرسێم

١٢

ژیان بۆخنک بووە
بە دەریایەک گوڵاوی ئومێد
بۆنی خۆش نابێت
ناچارین بە سابونی یەئس
بیشۆین

١٣

شار پڕ بووە
لەو لافیتە رەشانەی
هەریەکەو چیرۆکێکیان
لە چەند دێڕێکدا کورت کردووەتەوە

١٤

مردنی مرۆڤێک
فەنابوونی هەزارەها خەونە
چون لە ناخی هەر مرۆڤێکدا
هەزاران رۆئیای کپ دەژین

١٥

ئەوەندەی ژیان تۆقاندوومی
مەرگ نەیترساندووم
ژیان بۆ خۆی
جۆرێکی ترە لە فیلمی ترسناک

١٦

ئەمرۆش نەبێت
سبەی ژیان بە لای مەرگدا
پێچ دەکاتەوە

١٧

مەرگم خۆش ناوێت
بەڵام لێم بووە بە گرێ
دەمەوێت نهێنییەکانی ئاشکرا بکەم

١٨

دڵەڕاوکێ
تەنیا لە ماڵی ژیاندا هەیە
لە مەرگدا
جگە لە جریوەی خامۆشی
هیچی تر نابیسترێ

١٩

لە تۆماری فەرمیدا
ناوی سیانیم بە هەڵە نوسراوە
راستەکەی ئەمەیە:
سەرکێش نامۆ ئازاد

٢٠

خەونێکی وێڵم
بە دوای سەرێکدا دەگەڕێم
جەرائەتی هەبێت بمبینێت

٢١

مارکس و تێزەکانی
نیتچە و کتێبەکانی
فوکۆ و شێتخانەکەی
ئەدۆنیس و شیعرەکانی
مێشکیان داگیر کردووم

٢٢

لەو ڕۆژەوەی

مام زۆراب مێوژ دەفرۆشێت[١]

من مێوژی غەم دەکڕم

٢٣

ئین تەیمیەم بینی

لەناو تیرۆریستە ڕیشدارەکاندا

کتێبی "فصوص"[٢]ی بەدەستەوە بوو

بە تەمای تەکفیری نووسەرەکەی بوو

٢٤

زانست دوو گیانە

مناڵی دڕەندەیەکی لە سکدایە

وەک دەڵێن ناوی تەکنۆلۆژیایە

---

[١] میوژی مام زوراب، وانەی زمانی کوردییە بو پولی یەکەمی سەرەتایی، دانراوی ماموستا "ئەمین بالدار". کە من بەهوی خوشکەکەمەوە یادەوەرییم هەیە لەگەلی.

[٢]کتیبی "فصوص" دانراوی عارفی گەورە "ئیبن عەرەبی"یە. ئیبن تەیمیە بەهۆی ئەم کتیبەوە ناوبراوی تەکفیر کرد.

٢٥

بەرنامەڕێژیی بۆ ژیان دەکات
ئەمە کارێکی خراپ نییە
بەو مەرجەی تێگەیشتبێت
کارەساتێکی کتوپڕ
دەتوانێت ئەو پلانانە تێکبدا

٢٦

دوێنێ پزیشکەکە
وەک ئەوەی ئیسپانی بێت و
بە زمانی هیندیی قسە بکات
بە ریتمێکی هێواش پێی گووتم
تووشی سەرەتان بوویت!
لە ئەمڕۆوە بووم بە سەرباز
لە بەرەی جەنگێکی نادیاردام

٢٧

تاکە ناپاکییەک
هاوڕێیەک لە هاوڕێکەی تری کردبێ
بە لای منەوە جوان بێت
خیانەتی ماکس برۆد بوو[١]
لە وەسێتنامەکەی کافکا

---

[١] ماکس برود، هاوڕی هەمیشەییەکەی "فرانتس کافکا". وەسیتەکەی کافکای جێبەجێ نەکرد کە داوای سووتاندنی هەموو دەستنووس و بەرهەمە ئەدەبییەکانی خۆی کردبوو. بەپێچەوانەوە هەموویانی چاپ کرد.

٢٨

ئەگەر كافكا
سەرەتا مشتەری پوفەكان[١] نەبوایە
نەیدەتوانی لە دوماهیدا
خۆشەویستی راستەقینە بدۆزێتەوە

٢٩

لە رێی شیعرێكی بێ شعورەوە
بە یارەكەم رادەگەیەنم
هێندەی نەماوە
من بەرگی سپی و
تۆش بەرگی رەش بپۆشی!

٣٠

لە ئینجانەی شكاوی رابردوودا دەژیام
لە ناكاو ئێستا پەلی راكێشام
تكتێكی خێرای ئایندەی بۆ بڕیم
فریا نەكەوتم هیچ بڵێم

---

[١] پوف، خانەكانی سێكسفرۆشی دەگرێتەوە. لە بەناوبانگترین ئەو پوفانەی كافكا بوی دەچوو، ناوی "گۆلد شمیت" بوو.

٣١

ویستم نامەیەکت بۆ بنووسم
سەرکۆنەت بکەم
کاتێکم زانی وێنەی خۆم دەکێشم
لە ئامێزی تۆدا

٣٢

زۆینەی خەڵک ناگەنە راستی
چون چاویان بە پەڕۆیەکی رەش بەستووە و
بە دوای موروی هەقیقەتدا دەگەڕێن

٣٣

هەمیشە فڕکان فڕکانمە
غەمێک جێدەهێڵم و
پێ دەنێمە نێو غەمێکی تر
لەبەرئەوەی نوێگەرییم پێ خۆشە
باز دەدەم بۆ غەمێکی تازەتریش
ئیتر تا کۆتایی هەر ئاوا..

٣٤

مێژوو دەردەپیریی گرتووە
هیچی بیر نایەتەوە
کاتی ئەوەیە
بیکەینە شایەت لەسەر درۆکانمان

٣٥

سیاسییەکان
هیچیان ناتوانن ببنە چیرۆکنووس
شانازییەکیان نییە شایانی گێڕانەوە بێ

٣٦

بە رێکەوت یەکترمان ناسی
بە رێکەوت عاشقی یەکتر بووین
بەڵام بە رێکەوت جیا نابینەوە

٣٧

من مرۆڤێکی دێرینم
بە قاچاغ پەڕیومەتەوە ئەم سەدەیە
ئای خودا چیم بە خۆم کرد؟
کێ قاچاغچییەکی زیرەک دەناسێ
بمباتەوە بۆ سەردەمی خۆم؟

٣٨

نە دوێنێ لە ئەمڕۆ رووناکتر بوو
نە سبەی لە ئەمڕۆ رۆشنتر دەبێ
ئەوەتەی مرۆڤ هەیە
راوی تاریکی دەکات

٣٩

پێش مردنی
لە لەدایکبوونی
پەشیمان بووەوە
پەکو چ درەنگ تێگەیشت؟

٤٠

چاو بەناو فۆتۆکانما دەگێڕم
وێنەیەک نادۆزمەوە
تێیدا رووم گرژ بێت
ئای چەند درۆزنم
هەموو ژیانم رووگرژانە لێ گوزەرا!

٤١

شیعری کوردیی
لە "بابا تاهیر"ەوە بە پیاوسالاریی
دەستی پێکرد
لە "شێرکۆ"دا بە بێکەسیی مرد

٤٢

نالی چەندێک جوانە
پێش ئەوەی بێتە
سەر باسی مەستوورە[1]

٤٣

تاریکییەکی رووناک
رووناکییەکی تاریک
چەشنی منداڵێکی چەتوون
لە مندا قسە دەکات

[1] نالی لە شیعریکدا لە روانگەی سیکسوالیتییەوە بەرەنگاری مەستوورەی ئەردەلان ددبیتەوە. مەستوورەش وەک یەکەم فیمیسنتی کورد رەخنە لەوە ددگریت نالی لە ریی جەستەوە هەولی شکاندنی دەدات.

## ٤٤

به لای دیجلەدا رەت بووم
چەتە ریشدارەکان
مێژووی نەینەوایان[١] دەسڕییەوە
عەشتارم بینی دەگریا
هەر دەگریێ و ژێر نابێتەوە

## ٤٥

ئارەزوو دەکەم
لە وێنای ئێستای خۆم رابکەم
بەمەبەستی گەیشتن
بە وێنایەکی زبرتر[٢]ی خۆم

---

١ ئاماژەیە بو ئەو رووداوانەی لەم چەند مانگەدا لەسەر جەستەی شاریکی مێژووی وەک نەینەوا لەلایەن چەتە داعشەکانەوە قەوماون. عەشتاریش وەک خواوەندی ئاشوری دێرین و نەینەوا جگە لە گریان هیچی بو نەماوەتەوە.

٢ وینایەکی زبری خوم بو ئەمڕو زۆر پیویستە، باجی ناسکیی وێنای تا ئیستام دەدەم. ئەڤرۆ 2011-4-22 یادی سەد و سیانزەی ساڵەی رۆژنامەوانی کوردییە، من ئیستا رۆژنامەوانێکی کودیتا بەسەرداکراوم.

٤٦

شاعیر شێتانە دەدوێت
شاعیر شێتانە عاشق دەبێت
نیگایەکی سارد
دڵی شاعیر گەرم دەکات

٤٧

ببینن قەسابەکان
لەبەر حەشاماتی خەڵک بەرناکەون
لەولاوە کتێبفرۆشەکان
لەناو کتێبەکاندا وەنەوز دەدەن

٤٨

شیعر چێشتێکی فۆلکلۆرییە
نەوەی هەنووکە حەزی لێ نییە
رۆمان لە مەکدۆناڵ دەچێت
زۆرترین داواکاریی لەسەرە

٤٩

نابیناکان
بە دوو چاوی رۆشنەوە
خەون دەبینن
خاوەن بیناییەکان
خەونێکی کوێریش نابینن

٥٠

هەموو خەریکی کۆکردنەوەی پارەین
بە نیازی ئەوەی بەختەوەریی پێ بکڕین
بێ ئەوەی بزانین
پارە بەختەوەریی لەناو دەبات

٥١

من شتێکم هەیە
کەسی تر نییەتی
تۆم هەیە
تۆ شتێکت هەیە
کەسی تر نییەتی
منت هەیە

٥٢

شەڕی ئێستامان
لەسەر پارەیە
شەڕی سبەینێمان
لەسەر کولێرەیەکە[١]

٥٣

ڕووی ڕەشی وەهم
لە ترسی هەقیقەت
سپی هەڵگەڕا

٥٤

چ ئافاتێکە
کە ئاوێنەکان درۆزن دەبن
دنیا خوارو خێچ دەبێت

٥٥

کە لە فڕۆکەی خەونێکەوە
بەردەبمەوە ناو واقیع
تووشی لەرز دەبم

[١] ئەمرۆ 2012-1-14 بیرم لەوە دەکردەوە رۆژێک دێت پارە نامێنێت و دانەوێڵە بەپێی پێویست بۆ ئەو مرۆڤایەتییەی ئەمیبائاسا زیاد دەکات دابین نابێت. ئەوسا لەواشەیەک رەنگە هۆکاری روودانی جەنگێک بێت، لەوانەشە وا نەبێت من ببزرکێنم.

٥٦

له هەموو شوێنێک
به دوای خۆمدا گەڕام
له هیچ کوێ خۆم نەبینی
له کۆتاییدا
له کتێبێکدا خۆم دۆزییەوە

٥٧

ئاینەکان
کێم و جەراعەتن
دومەڵی سەر پێستی جیهانن

٥٨

له نامەکەدا بۆم نوسیبوی
تینووەمە
تۆش نامەکەت
خستە پەرداخێک ئاوەوە
هەمان رۆژ منیان به خنکاویی دۆزییەوە

٥٩

هێشتا هیوایەک ماوە
مادام پێی گووتم
لە دڵت دەرمبکە
بەڵام نەیووت
لە دڵم دەرتدەکەم

٦٠

ئای ٢٠١٣
بەوەدا دەزانم
ژمارە سیانزە شوومە
«شێرکۆ»ی تیا مرد[١]

٦١

بەوەدا دەزانم
مرۆڤ لە گڵ نەئافرێنراوە
کەسم نەدیوە لە کاتی مەلەوانیدا
ببێت بە تۆپەڵێک قوڕ

---

[١] دوێنێ 2013-8-4 شاعیری گەورە و ئینسکلوپیدیای وشە "شێرکۆ بێکەس" بۆ هەمیشە ئوغری کرد.

٦٢

له ناوەڕاستی ژیاندام
ئیمەیلێکم له مردنەوە بۆ هاتووە
داوا دەکات
ئامادەکاریی بکەم بۆ پێشوازیکردنی
شەرم دەکەم بڵێم جارێ زووە

٦٣

ژیانم دوو قۆناغە
قۆناغی پێش عەشقی تۆ
کە بە شادمانی دەژیام
قۆناغی دوای عەشقی تۆ
کە بە کوێرەوەریی دەژیم

٦٤

مردن چەتەیەکی نادیارە
هەر جارەی یەکێک دەڕفێنێت
ئیتر کەسمان نایبینینەوە

٦٥

له دوای مردن
هەموو کەسێک جوانە
دەمانەوێت تەنیا جوانییەکان
بە بیر خۆمان بهێنینەوە

٦٦

«دوورکەوتنەوە بەرەو رووم دێ»[١]
لەم دێڕەدا
بە تەواوەتی خۆم ناسییەوە
ئاه چەند دوورم لە خۆم

٦٧

زەرفەکەم کردەوە
نامەکەتم خوێندەوە
لە هەموو نامەکانی تر
باشتر لێی تێگەیشتم
هەرچەند هیچت تێدا نەنوسیبوو

[١] دێرە شیعرێکی "د.ئەحمەد مەلا"یە. لە کتێبی "کۆی شیعرەکانی ئەحمەدی مەلا 1974-2006" لاپەڕە 297.

٦٨

به بەلەمێکی بچووکەوە
زەریای کتێبەکان دەبڕم
نە زەریا کۆتایی دێت
نە دەتوانم بگەڕێمەوە

٦٩

هاوڕێکەم گووتی
رەشبینی لە تۆدا چێنراوە
کەمێک رامام
هەرچەندم کرد نەمتوانی بڵێم
من لە رەشبینیدا رواوم

٧٠

خاڵێکی رەشم
لەسەر کاغەزێکی سپی
من خاڵەکەم
بەڵام ئێوە ناوتان نییە

٧١

نازانم
یەکەمین گەلحۆ کێ بوو
کاتی دابەش کرد
بە سەر چرکە و دەقە و سەعات و
هەفتە و مانگ و ساڵەکاندا؟!

٧٢

کۆتایی عەشق پەیمان شکاندنە
شێتێکی عاشق
عاشقێکی شێت
وەهای فەرمووە

٧٣

ئادرەسی نوێی من:
مەملەکەتی جەهەنم
شاری ئاگر
گەڕەکی نێڵە نێل
کۆڵانی دوکەڵ

٧٤

له حامورابییەوە تا ئێستا
یاسا
پاساو بۆ دڕندەیی دەهێنێتەوە

٧٥

مارکس
بە ریشی سپییەوە
لە خوا دەپاڕایەوە لێی خۆش بێت
لە پای ئەو تاوانانەی
ستالین بەناوی ئەوەوە دەیکردن

٧٦

پرسیارێکی نوێ
برینێکی دێرینم بکولێنێتەوە
ئەوەیە لێم بپرسن
ماڵتان لە کوێیە؟
نازانم بۆچی هەمیشە
ئەم پرسیارە دەمگرینێ؟

٧٧

به مەستیی ڕێم ئەبڕی
ئیشتهای قسەکردنم زۆر بوو
گڵۆپە زەردەکانی شەقامەکەش خەواڵوو بوون
نەمدەزانی چیرۆکەکەم بۆ کێ بگێڕمەوە
ناچار بۆ خۆمم گێڕایەوە

٧٨

لە میسر
هێندەی لە کەلاوە رووخاوەکاندا[١]
جوانیم بینی
لە شوێنە لوکسە هاوچەرخەکاندا
هەستم پێنەکرد

٧٩

ئەوەت هەمیشە لە بیر بێ
پێش جەستەم
دڵم رادەست کردیت
تکایە بیرت نەچێت

[١] کەلاوە رووخاوەکان لێرەدا مانای هەرەمەکان و شوێنەوارە مێژووییەکانی تری میسرە.

٨٠

ئارەزووویەکی سەیرم
بۆ گەشتکردن هەیە
بە کەشتی لەناو دەریادا
بۆیە پەیڤەکانم
هەمیشە تەڕ و سوێرن

٨١

هەفتەی پێشوو لە پاریس
لە نزیک بورجی ئیڤڵ
زنجییەکی رووخۆش
پۆرترێتێکی کێشام
رووخسارم غەمێکی قووڵی پێوە دیاربوو
زۆر لە ئێستای خۆم ناچێت
رەنگە لە ئایندەم بچێت

٨٢

خۆشەویستیت دیلی کردووم
گەر هیچت پێ ناکرێت
کەلەپچەکانم بکەرەوە

٨٣

لە ژیاندا یەک ئەرکمان هەیە:
یەکترمان خۆش بوێت
هەر کارێکی تر بکەین
لە پەراوێزی ئەرکە سەرەکییەکەدایە

٨٤

گەر لای هەموو کەس
پەسەندکراو بیت
هەڵەیەک هەیە لە تۆدا
بە وردیی بە دوایدا بگەڕێ

٨٥

منداڵیمان شەڕی ئێران - عێراق
تاڵی کرد
هەرزەکاریمان شەڕی ناوخۆ
رایماڵی
گەنجیمان غوربەت رفاندی
پاشماوەی تەمەنمان
کەوتە تەڵەی نوستالیژیاوە
ئەرێ کەنگێ ژیاین؟

٨٦

ژیان کلافەیەکی ئالۆزکاوە
ئەو کەسانەم خۆش ناوێت
سەرپێی و گاڵتەجارانە
سادەی دەکەنەوە

٨٧

هۆکاری ئەوەی تا ئێستا
خۆم نەکوشتووە
تەنها بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە
حەز بە گەمە قورسەکان دەکەم

٨٨

بە درێژایی تەمەن
بوونەوەرێکی گومانکار بووم
ئەگەرنا
لە هیچدا نەدەگەیشتمە دڵنیایی

٨٩

سەر لە مەتەڵی ژیان دەرناکەم
لە کۆتاییدا مەرگ دێت
ئەوسا تێدەگەم
خۆم مەتەڵەکە بووم

٩٠

شیعر بۆ هەمیشە وەک سێبەر
بە تەنیشت مرۆڤەوە دەمێنێتەوە
مرۆ چۆن دەتوانێ
دەستبەرداری زمانی ناخی بێ؟

٩١

لە ئەشکەوتەکانی رابردوو
وەرنە دەرەوە
لە سەنگەرەکانی ئەمڕۆوە
رووبەڕووی داهاتوو ببنەوە

٩٢
هیگل گووتی
«مێژوو دوو جار خۆی دووبارە دەکاتەوە»
مارکس دێڕێکی خۆی خستە سەر
«جارێ یەکەم بە تراژیدیی، دووەم جار بە کۆمیدیی»
پرسیار من ئەوەیە
ئەی جاری سێهەم؟

٩٣
پلاتۆ
شاعیرەکانی لە کۆمارەکەی دەرپەڕاند
شاعیرەکان
کۆمارەکەی ئەویان
خستە قەسیدەکانیانەوە

٩٤
دەبەنگترین کورد
کەمێ لە سروشتی ئەڵمانەکان تێدەگا
زیرەکترین ئەڵمان
لە سروشتی کورد تێناگات

٩٥

راسیزم
لە دەرمانی مەلاریا دەچێت
پێش کوشتنت
بە گێژ و وێژبووندا دەتبات

٩٦

لە زیندانی ئاسایشدا
پرسیارم لە بەندییەکانی تر دەکرد
ئاخۆ لەسەرچی گیراوم
ئێستاش وەڵامم دەست نەکەوت!!

٩٧

نیتچە
خودا و شادیی پێکەوە
خستە گۆڕەوە
بەوەش تراژیدیا لە دایک بوو[١]

[١] هێمایە بۆ کتێبی "لە دایکبوونی تڕاژیدیا"ی فەیلەسوفی ئەڵمانی "فریدریک نیتچە".

٩٨

شەیتان

لە ڕۆحمدا نیشتەجێیە

خوداش دراوسێیەتی

نابینم

هیچ ئاریشەکیان لەگەڵ یەکتر هەبێ!

٩٩

یادت دەکەم

نیشتمانی هەڵپڕوکاوم

بەڵام «جگە لە فرمسێکی چاوم

هیچی تر شک نابەم»[١]

ئەی ئەگەر چەمی ئەسرینم

وشکی کرد؟

١٠٠

لەسەر قادرمەی دوێنێ

قاچم خلیسکا

کەتمە هەیوانی ئەمڕۆوە

خۆم بۆ ناگیرێتەوە

بەرەو ژێرزەمینی سبەی دەخزێم

[١] دیرە شیعرێکی فەیلەسوفی مەزن "کارل مارکس"ە.

١٠١

تا پاریش وا تێدەگەیشتم
دنیا لەگەڵ من لە دایک بووە
لەگەڵ منیش دەمرێت
لێ هیچ کات ناتوانم
باوەڕ بە مردنی خۆم بکەم

١٠٢

ژیان چییە؟
گەمژە و فەیلەسووفێک
بەرسڤیان دایەوە
وەڵامی هیچیان راست دەرنەچوو

١٠٣

جاران دەیانووت
«مرۆڤی شیاو بۆ شوێنی شیاو»
پرسیارەکە ئەمەیە
ئایا مرۆڤی شیاو ماوە؟

١٠٤

هەرچی مۆمی دنیایە
ناتوانن تاریکایی تەکنۆلۆژیا
رۆشن بکەنەوە

١٠٥

هەرچیم نوسیوە
تەنانەت بە رەشبینییەکانیشمەوە
بۆ جوانترکردنی دنیا بوو
نەمزانی خوێنی خۆم خستۆتە کاسەوە

١٠٦

تاکە جیاوازیم لەگەڵ خەڵک ئەوەیە
ئەوان سەرکەوتنەکانیان نمایش دەکەن
من شکستەکانم دەخەمە روو

١٠٧

زۆر حەز دەکەم
کتێبێک بنووسم
دژی هەموو کتێبەکانی تر

١٠٨

تا چاوبڕ ئەکا

دیوار

دیوار

د ی و ا ر

هەر

د

ی

و

ا

ر

دووی نیسانی ٢٠١١ تاکو ٢٧-١١-٢٠٢٠ واتە سێ رۆژ پێش دووەم نەشتەرگەریی هەڵدانەوەی کاسەسەرم لە نەخۆشخانەی گلیاد ئاینس

١

تەمەنم لە چل ساڵ رەت بووە
خوێنەرێکی تەمبەڵیش نیم
چارەگێک لەو کتێبانەم نەخوێندووەتەوە
دەبوو بیانخوێنمەوە

٢

نامەکەت پڕ بوو لە هەڵەی چاپ
دیقەتم دا لە رێزماندا کۆڵەواریت
بە هەزار حاڵ ئەوەم بۆ خوێندرایەوە
کە نووسیبووت: خۆشم ئەوێی

٣

لە دوا دیداردا
کاتێک ماڵئاواییم لێکردی
نەمزانی نەک کیشوەرێک
بەڵکو ژیانێک لێت دوور دەکەمەوە

٤

وەختێ گەڕامەوە بۆ تاراوگە
بریسکانەوە و تەڕیی
چاوەکانی دایکم ترساندمی
نەمزانی جامێ ئاو بڕژم
بە دوای خۆمدا

٥

حەزم بە سەفەر و تەنهایی دەکرد
دەنگێک لە ئاسمانەوە فەرمووی
خۆم دانەیەکیانت بۆ هەڵدەبژێرم
لەو مەغریبەوە وەکو خۆی تەنیام

٦

لە شەمەندەفەرێکدام
بە پێچەوانەوە رێ دەکات
بەرەو رابردوو دەگەڕێتەوە
لە هەر وێستگەیەک دەوەستێت
نامەوێت دابەزم
کاتێک دەزانم گەڕاومەتەوە
نێو سکی دایکم

٧

من باسی واقیعی باو ناکەم
باسی واقیعێک دەکەم
خۆم ئافرێنەریم
واقیعێک رێک لە خۆم دەچێت

٨

بۆ ئەوەی شتێک جوان بێت
مرۆڤ بڕیاری لەسەر دەدات
جوانی لە گەردووندا
دیاردەیەکی مرۆڤانەیە

٩

کامێرایەکم بدەنێ
توانای هەبێت
وێنەی خەونەکانم بگرێت
تا چیتر لۆمەم نەکەن
لەسەر رەنگی بزرکاوم

١٠

بیری خۆم دەکەم
لەو وێنەیەی بە قوڵی پێدەکەنیم
بیست و پێنج ساڵە
پێکەنینەکەم لە ئاسایش زیندانە[١]

١١

گەشبینی تلیاکی گەلانە[٢]
لەوەتی هەم
رامکردووە لێی

١٢

لەگەڵ کچێکی سوێدییدا
بووم بە هاوڕێ
مەبەستم بوو چیرۆکی خۆمی بۆ بگێڕمەوە[٣]
چووینە بارێک
بەدەم پێک هەڵدانەوە وتم "سکول"
ئەو گووتی بخۆینەوە یان قسە بکەین؟

---

[١] لە رووداوەکانی شەڕی ناوخودا ئەمنی کوردیی "ئاسایش" هەلیانکوتایە سەر مالمان، بەوەش رازی نەبوون بەسەر باوکمدا هینایان، ئەلبومی وینەکانیشیان بردین و نەمانبینینەوە. نەمریی بنەمالەیەکیان کوشت.

[٢] هەلگیرانەوەی وتەزاکەی مارکسە "ئاین تلیاکی گەلانە"ە.

[٣] نوکتەیەکی ئەسکەندناڤی هەیە لەم بارەوە، بەلام لەو پیکەود تاقەتی گیرانەوەم نەماوە.

١٣

هێندە چێژ لە بێدەنگی وەردەگرم
حەواسم نەماوە
لەگەڵ خۆشم بدوێم

١٤

دەمویست بنووسم
من مرۆڤێکی شادومانم
لەم کاتەدا
پاندانەکەم مرەکەبی تیا نەما

١٥

ناسینەوەم ئاسانترین کارە
شەبقەی ئازارم لەسەردایە
بەرگی نائومێدیم پۆشیوە
پێڵاوی نەگبەتییم لە پێدایە

١٦

له سلێمانی
دەفتەرێک شیعرم
له تەکسییەکدا له بیر چوو
دوو رۆژ دواتر
له کۆڕێکی شیعریی ئامادەبووم
که شاعیرەکه شۆفێری تەکسی بوو

١٧

هەر کاتێک
لەسەربانی خەونێک دەکەومە خوارەوە
له بری ئەوەی گیانم دەرچێت
شیعرێک دەردەپەڕێت

١٨

من له دوێنێی خۆم ناچم
بۆچی لەسەر قسەیەک
دادگاییم دەکەن
بیست ساڵ لەمەوبەر کردوومە؟

١٩

هەمیشە لایەنگری تازەگەریم
چل ساڵە
بە دوای فۆرمێکی نوێدا دەگەڕێم
بۆ خۆکوشتن

٢٠

رەشبینی شتێکی کەمترە
لەو تاریکییەی رۆحی داگیر کردووم
کاری من لەمەودوا ئەوەیە
فەرهەنگەکان بپشکنم
تا ناوێک بدۆزمەوە بۆی

٢١

زەردەخەنە هەمیشەییەکانم
پێکەنینە نەپساوەکانم
ناتوانن ئەو راستییە بگۆڕن
پیاوێکی تراژیدیم

## ٢٢

خۆم لە هەموو کەس شاردۆتەوە
ژوورێکی بێ پەنجەرەم هەیە
مێزێکی شڕڵەی تێدایە
کوپێک چا و کتێبێکی "هۆبز"ی لەسەرە
گوێم لە لورەی گورگە[١]

## ٢٣

بە خۆشحاڵییەوە
بە دەمانچە خۆم کوشتم
ساتێ لە خەوەکە راپەڕیم
دڵتەنگی قووتی دام

## ٢٤

وا تێدەگەم
دوای مەرگی من
شتێک بە ناوی ئازارەوە
لە ئارادا نامێنێت

---

١ فەیلەسووفی ئینگلیزیی "توماس هۆبز" دەیگووت "مرۆڤ گورگە بۆ برا مرۆڤەکەی تری".

٢٥

ئەوەی پێی دەوترێ ژیان
هیچی دیکە نییە
جگە لە خەونی مردوویەک
لە گۆڕێکی شێداردا

٢٦

ژیانم
کراسێکی چڵکنە و
لە سەد لاوە پینەم کردووە
کاتی هاتووە
لەبەری داکەنم

٢٧

یادداشتنووسەکان
گیرفانی مێژوویان
پڕ کردووە لە درۆ

٢٨

نەجمەدین مەلام بینی[١]
بە کەشتییەکەیەوە
بەرەو ئێرە دەگەڕایەوە
بڕیاری دا بوو
لە زانکۆکانەوە دەست پێبکاتەوە

٢٩

سەیری ئاوێنە دەکەم
لەبەرخۆمەوە دەپەیڤم:
ئەم پیاوەم لە شوێنێک بینیوە
دوای ماوەیەکی زۆر
بیرم دێتەوە
ئەوم لە باوەشی ژیاندا بینیوە

٣٠

جاران نامەم بۆ هاوڕێکانم و
بۆ خۆشەویستەکەم دەنووسی
ئەو خووەم دەمێکە تەرک کردووە

[١] نەجمەدین مەلا 1898-1962، نووسەر و رۆژنامەوانی کورد و خاوەنی پرۆژەی "کەشتی نوح" بۆ لەناوبردنی نەخوێندەواریی، بەو کەشتییە هەزاران کەسی لە خنکان لە دەریای نەخوێندەوارییدا رزگار کرد.

کەچی هەر بەردەوامم لە نامە نووسین
بۆ هیچ کەس
نا بۆ خۆم

٣١
نامەیەکم بە خۆمدا نارد
بۆ مەعشوق
خۆمی گل دایەوە و
نامەکەی گەڕاندەوە
بۆ سندووقی پۆستەکەم

٣٢
لە ترسی راسیزم
رەگە رۆژهەڵاتییەکەی خۆم
لە گۆرەوییەکانما دەشارمەوە
وەک چۆن لە بەغداد
بە هەمان شێوە
کوردبوونی خۆمم حەشاردا

٣٣

لە خۆم دەگەڕێم
هەر دەگەڕێم
بەردەوام دەگەڕێم
دووبارە بۆی دەگەڕێم
"بێ ئەوەی شتێک بدۆزمەوە دەگەڕێم"[١]
تا کۆتایی بۆ خۆم دەگەڕێم

٣٤

جیهان تووشی شەقیقە بوو
لە تاو بێدەنگی قریشکە و
هەراوزەنای کپی و
هاوارە بێدەنگەکان

٣٥

ئەم عەزابەی من
لە خودی ژیان درێژترە
ئەی بۆچی رستەکە
بە تەواوکراویی نالێن
ژیان کورتە و ژان درێژ؟

[١] دیرد شیعریکی شاعیری مەکسیکی "ئۆکتاڤیۆ باز"ە.

٣٦

لە هابیل و قابیلەوە
پیاوەکان لەسەر ژن
یەکتر پارچە پارچە دەکەن
نەمبینی لەسەر پیاو
ژنەکان یەکتر بکوژن

٣٧

من نووسەری کتێبی ئومێدم
نووسەری رۆمانی بەختەوەریش
ئایا لێم تێدەگەن
بۆچی بەخۆم دەگووت درۆزن؟

٣٨

لە خەونمدا مردبووم
لە ناکاو راچڵەکیم
ئای چەند پەشیمانم
درێژەم بەو خەونە نەدا

٣٩

چی لە ژیانێک بکەم
خەونێکی ناخۆش بێ لە خەوندا
زیندانێک بێت لە زینداندا؟
ئارەقەی سارد دەکەمەوە

٤٠

جاران فەلسەفەی ژیان
ململانێ بوو لە پێناوی مانەوەدا
هەنووکە ململانێیە
لە پێناوی لە ناوچووندا

٤١

کە مێژوو دەخوێنمەوە
خۆشحاڵم لەو دەمەدا نەبووم
کە بیر لە ئایندە دەکەمەوە
خۆزگە ناخوازم لەوێ بم
ئێستاش کە لێرەم
حەز لەم لێرەبوونە ناکەم

٤٢

ماڵی رابردوو شوێنەواری نەماوە
ماڵی نهۆ پڕ بووە لە ڤیرۆس
ماڵی داهاتوو بە قوڕ گیراوە

٤٣

شارستانی تازە
شارستانی لە جامخانەنانە
ژن و شمەکەکان
وەک یەک لەو دیو جامخانەکانەوە
دەکڕدرێن و دەفرۆشرێن

٤٤

دیموکراسی
هەروەک پیاوێکی نەزۆک
توانای نەماوە
بەهای تازە بخاتەوە

٤٥

له خوێندنەوەی مێژوو
یەک راستی فێربووم
کۆنترین پیشەی مرۆڤ
سێکسفرۆشی و گەوادییە
کۆمێنتی ترم نییە

٤٦

لینین
بە پارەی هەواڵگریی ئەڵمانی
دەیویست "راستی"[١]
بۆ هەمیشە بەردەوام بێت

٤٧

راستە خاوەنی پارە نیم
کە زۆر گرنگ نییە لام
ئەوەی جێی بایەخمە
پارە خاوەنی من نییە

[١] لیردا "راستی - پراڤدا" بە مانای روژنامەی فەرمی پارتی کومونیستی روسی "بەلشەفیک" هاتووە. ئەم رۆژنامەیە هەشتا سال بەردەوام بوو لەدەرچوون، لە 1914 دەزگای هەوالگریی ئەلمانی تیچووی ئەم رۆژنامەیەی دابین دەکرد!.

٤٨

رایش هاتووەتە بن کڵێشەم
پێمدەڵێت "هەقیقەتەکە بدرکێنە
با زۆریش لەسەرت بکەوێت"[١]
هەقیقەتەکەم درکاند
هەموو کەوتنە قاقای پێکەنین

٤٩

داپیرەم هەموو سات دەیگووت
ئەوەندەت کتێب خوێندووەتەوە
مێشکت لە دەستداوە
بە کوڵ پێدەکەنم
گەر کتێبەکان عەقڵی منیان تێکدابێ
تۆ بڵێی حاڵی نووسەرەکانیان چۆن بێ؟

٥٠

هەموو داهێنانێک زمانە
شتێک دەردەبڕی
پێش تۆ
لە مێشکی هەزاران کەسدا بووە

[١] دێڕێکە لە کتێبی "گوێ بگرە پیاوی بچووک"ی ولیەم رایش.

٥١

له باسکردنی مەرگیشدا
سەرقاڵی بەرهەمهێنانەوەی ژیانم
ژیان تا دوا سنوور بێ مانایە
بۆیە بە جدیی وەرمگرتووە

٥٢

ئۆرفیۆس[١]
لە روحما چەنگ دەژەنێ
لە دڵمدا گۆرانی دەڵێت
لە مێشکما سەرچڵی ئەکات
من رەگەزم دەچێتەوە سەر ئەو

٥٣

نیازم بوو
لە بەردەم نەخۆشخانەی منداڵبوون
تابلۆیەکی رەش هەڵواسم
لەسەری بنووسم
چاوگەشەکان بەخێرهاتن
بۆ جیهانێکی بێسەروبەر

---

[١] ئۆرفیوس، کوری هەردوو خواوەندی دەریا و هونەرە لە میتولوژیای گریکییدا. هاوکات سترانبێژ و چەنگ ژەنیکی بیهاوتایە لە دنیادا. رەمزی وەفاداریی و خوشەویستی و قوربانیدانە لە پیناوی عەشقدا.

٥٤

ژنەکە
خەونی بە ئازادییەوە دەبینی
پیاوەکان
خستیانە زیندانی شیعرەوە و
لە دیوانەکاندا دەستدرێژییان کردە سەری

٥٥

لەوەتی هەم
بە دوای شتە نەبووەکاندا دەگەڕێم
بۆ نموونە
ئازادیی یان خۆشنودیی

٥٦

بۆ برینەکانی خۆم دەنووسم
گەر تۆ برینی قووڵت نییە
چۆن دەتوانیت بیخوێنیتەوە؟

٥٧

بیۆگرافی خۆم دەگێڕایەوە
باسم لەو غەمە زنجیرەییانەی ژیانم دەکرد
بڕستیان لێ بڕیوم
لە کۆتاییدا وتیان چیرۆکێکی هونەریی جوانە
شایانی کورتە فیلمە

٥٨

بە درێژایی تەمەن
دژایەتی خۆم کردووە
بە هۆی سکاڵای ئەوەوە
لە نەخۆشخانە زیندانم

٥٩

دەمەوێت پێش کۆتایی
بۆ یەک خولەک
روخسەت لە مەرگ بخوازم
دوو تف بگرمە ناوچەوانی ژیان

٦٠

هەر سەرزەنشتم دەکەیت
گوایە پیاوێکی ونم
دە زەحمەتێکیش بکێشە
بمدۆزەرەوە

٦١

هەمیشە بۆ زاڵبوون بەسەر ئازار و
لە دژی کرۆکی ژانەکانم دەنووسم
پێم سەیرە کەسانێک هەن
بێ ئەوەی ئازاریان هەبێ دەنووسن

٦٢

هەموو کورد
داوای تەبایی دەکەن
بە تەنها منم
داوای ململانێ دەکەم

٦٣

هەموو بە قەرەباڵغی
خۆیان دادەپۆشن
بە تەنها خۆم
پەرژینی ئاپۆرام تێپەڕاند
باش بوو نەبووین بە دوان

٦٤

تا شارەکان بچووکتر ببنەوە
قەرەباڵغی زۆرتر دەبێت
بە پێچەوانەوەشەوە هەروا

٦٥

هاندەری فەشەلەکانم
مامۆستاکانم بوون
هاندەری سەرکەوتنەکانم
خودی خۆم بووم

٦٦

ئەوەی دەڕوات
پشکنینی زیرەکی دەکات[١]
دەبەنگەکانن
چون دەیانەوێت
دڵنیابنەوە لە دەبەنگیان

٦٧

بۆ ئەوەی بەهای تازە
لە دایک ببێت
پێویستە مرۆڤی هاوچەرخ
بمرێت

٦٨

رۆژێک دێت
کارێک بە خۆم دەکەم
"رۆسۆ" بەخۆی نەکردبێ[٢]
"شاتوبریان" بحەپەسێت[٣]

---

[١] تیستی زیرەکی "ئای کیو" تیستێکی نوشداریی هاوچەرخی میشکە بۆ دەرخستنی راددەی زیرەکی.

[٢] ژان ژاک روسو لە ئوتوبیوگرافییەکەدا "دانپیانانەکانم" کاریک بە خوی دەکات یا بە دەواری شری نەکردبیت؟

[٣] رینیە شاتوبریان. نووسەری فەرەنسی لە رومانە یاداشتی "ذکریات من وراء القبر" هەمان کار دەکات کە روسو پیشتر کردبووی.

٦٩

ئەگەر ناچارم بکەم
لە نێوان مارکس و نیتچەدا
یەکێکیان هەڵبژێرم
مارتچە[١] هەڵدەبژێرم

٧٠

ئەوەی مارکس
بە خۆڕایی فێری کردم
ئادەم سمیس[٢]
بە یەک ملیۆن دۆلار
فێری نەدەکردم

٧١

مەمەدی دووەم
لە بیست و یەکساڵیدا
قوسەنتینیەی داگیرکرد
لەبەرئەوەنا لەشکری بەهێزی هەبوو
بەهۆی ئەوەی خەونی مەزنی دەبینی

[١] مارتچە، لێکدراوی هەردوو ناوی مارکس و نیتچەیە. من هەمیشە ئەو دوو فەیلەسوفەم لە خۆمدا ئاشت کردووەتەوە.
[٢] ئادەم سمیس 1723-1790 فەیلەسوف و ئابووریناسی ئینگلیزیی - سکۆتلەندیی. خاوەنی کتێبی "سامانی گەلان" و باوکی رۆحی بازار و ئابووری ئازاد و سیستمی سەرمایەدارییە.

٧٢

ملیۆنەها ساڵ
مرۆڤ بێ کتێب ژیاوە
ڕەنگە شارستانی نوێ
مەیلێکی زۆری هەبێ
بۆ ئەو ڕابردووە

٧٣

کتێب بۆ خۆی نهێنییەکە
هەموو نهێنییەک
بە وردیی ئاشکرا دەکات

٧٤

بۆم پرسیارە
بۆچی ڕەخنەگرانی ئەدەبی
ژانرێک بەناوی ئەدەبی ترسناک
لەوانی تر جیادەکەنەوە
مەگەر ژیان خۆی سامناک نییە؟

٧٥

هانا ئارێنت

جولەکەیەکی پابەند نەبوو
نازییەکان لەسەر ئەوە دەستگیریان کرد
منیش چەپێکی پابەند نیم
چەندان جار بەو بیانووەوە
نازییە کوردەکان گرتوویانم

٧٦

ژیان شتێکی قۆڕە
بە ژانی لە دایکبوون دەستپێدەکا
بە ئازاری مەرگ کۆتایی دێت!

٧٧

بە دەنگی بەرز بدوێ
ژیان کەمێک گوێی گران بووە
نەکا مەرگ وا بزانێ لەگەڵ ئەوتە

٧٨

بە دوای بیانوویەکدا گەڕام

تا خۆم بکوژم

هەرچەند سەرم هێنا و برد

لە ژیان زیاترم دەست نەکەوت

٧٩

لەمەودوا فیراق

دیاردەیەکی مرۆیی نییە

هیچ نەبێت

لە نێوان مرۆڤ و ئامێرێکدایە

٨٠

تا سەدەی بیستەم

عەشق گەڕان بوو

بە دوای نیوەکەی تردا

لەو مێژووە بەملاوە

نیوەکان بەهۆی نەشتەرگەریی جوانکارییەوە

یەکتر ناناسنەوە

٨١

ئاسودەیی کتێبێکە
بە زمانی هەسارەیەکی تر نووسراوەتەوە
کەس لێی تێناگات

٨٢

لە زیندانی نازییە کوردەکان
داوای پەرداخێک ئاوم کرد
پۆلیسێکی مۆن
پشتی بە دیوارەکەوە دابوو
بە پەنجە ئاماژەی بۆ دیوارەکە کرد و
وتی لەگەڵ منتە یان ئەو؟

٨٣

لە ژیانمدا نەمبینیوە
جگە لە مرۆڤە وریاکان
گێل و دەبەنگەکان بزر ببن!

٨٤

ژیان تەنگی پێ هەڵچنیوە
هەر رۆژەی دەردێکی دەداتێ
هێندە ترسنۆکە
جنێو بە مردن دەدات

٨٥

دەستمکرد بە ژماردنی غەمەکانم
لە دوای هەزارەوە لێم تێکچوو
ناچار لە سەرەتاوە
دەست بە ژماردنەوە کرد

٨٦

شیعری دەنووسی
هەرگیز نەبوو بە شاعیرێکی سەرکەوتوو
پاش چەند ساڵێک
وەک سیاسەتمەدارێکی بە ئەزموون
لە تیڤییەکانەوە لێدوانی دەدا

٨٧

لە یەکەم رۆژدا نووسیم
ژیان ناماقووڵە
ئەوە بۆ سی ساڵ دەچێ
تەفسیری ماقووڵانەی بۆ دەکەم

٨٨

شارستانی نویَ
پاپۆڕێکە لە ناوەڕاستی زەریادا
کاپتنەکەی تووشی سەکتەی مێشک بووە

٨٩

هەرچەند نائومێدیش بم
بەڵام خەونێکی سپی
رۆژگارێکی رەشم

٩٠

من کوردم
ئینگلیزەکان لە سەرەتای سەدەی بیست
حەبی خەویان خستە چایەکەمەوە
تا ئێستاش پرخە پرخمە

٩١

لە شیعرەکانم تێدەگەیت؟
رەنگە پرسیارەکەم گەوجانە بیَ
ئەگەر لێی تێگەیشتبایت
دنیات بە جۆرێکی تر دەبینی

٩٢

گوێم لە بێدەنگییە
گوێم لە کشوماتییە
گوێم لە هیچ شتێک نییە
بە دوای دەنگێکدا وێڵم
پێم بڵێت هێشتا زیندوویت

٩٣

زۆربەی ئەفسانە و
ڕۆمانە ترسناکەم خوێندووەتەوە
لە هیچیاندا دەعبایەکم نەدۆزییەوە
هێندەی تەکنۆلۆژیا سامناک

٩٤

شیعر گەمەیەکی رووتە
لەنێو خەیاڵدا
خەیاڵیش کۆلارەیەکە
دەزوولەکەی بچڕاوە

٩٥

حەزدەکەم بگریم
بۆ ئەو مرۆڤە نوێیەی
بیرکردنەوەکانی بە تازەیی
کۆن بوون

٩٦

ئەمە ڕێسایەکی کۆنکرێتییە
تا مێشک چالاکتر بێت
دڵ سستر دەبێت

٩٧

دڵی من ئیڤەرێستە[١]
بە دەگمەن شاخەوانە سەرچڵەکانیش
دەتوانن بگەنە لوتکەکەی
ئەوەشی گەیشت
جارێکی تر ناگەڕێتەوە

---

[١] چیای ئیڤەریست چیایەکە لە زنجیرە چیاکانی هیمالایا. بە بەرزترین چیا لەسەر ئاستی دنیا دادەنریت کە 8848 مەتر بەرزییەکەیەتی و هەمیشە کراسی سپی لەبەردایە.

٩٨

لە نیشتمان تەرە بووین
بە تەنیشت مەنفاوە گرمۆڵەین
نە دەتوانین بچینە ناو تاراوگەوە
نە قاچی گەڕانەوەمان هەیە بۆ وڵات

٩٩

هەر کات لە دەرگا بدرێت
دڵە خورپە دەمگرێت
داخۆ کام بێهودەییە
دەیەوێت خۆی بکات بە ماڵدا

١٠٠

دوێنێ ئێوارە
ژیان لە دەرگای دابوو
لە ماڵەوە نەبووم
ئەمڕۆ مەرگ
لە دەرگا دەدات
بە کورە بچووکەکەم دەڵێم
بڵێ باوکم لە ماڵ نییە

١٠١

ژیان هەقایەتێک بوو
داپیرەم دەیگێڕایەوە
نووکە ژیان بووەتە حکایەتێک
کەسمان نایگێڕینەوە

١٠٢

باسی رابردووم دەکەن
یان فاڵ بۆ داهاتووم دەگرنەوە
ناتوانن ئێستام ببینن

١٠٣

ئەگەر بڕۆیت
نامەوێت بە کوڵ بگریم
لەگەڵ پاشماوەی یادگارەکانت
خۆم خەریک دەکەم

١٠٤

هیچ کات ناتوانم
شیعرێک لە بارەی گەشبینییەوە بنووسم
رەشبینی قەڵەمێکە
تێکستەکانمی پێ دەنووسمەوە

١٠٥

تەنانەت ئیبلیسیش
هێندەی من لە ژیان حاڵی نییە
بۆیە جگە لە نەفرەت
هیچی ترم بۆی نییە

١٠٦

نیتچەم
لە ساڵی ٢٠٢١دا بینی
دەستبەرداری بەرزە مرۆڤەکەی ببوو
وەک مرۆڤێکی نزم
لە نۆرەدا وەستابوو
بۆ وەرگرتنی ڤاکسینی کۆرۆنا

١٠٧

ساڵی ٢٠٢١
دەبێتە مێژوو
بۆ ئەو نەوانەمان
ناویان رۆبۆتە

١٠٨

نەوەکانی ئایندە
بە بەزەییەوە دەڵێن
باشە باپیرانی ئێمە
لە سەردەمی ئینتەرنێتدا
چۆن کاتیان گوزەراندووە؟!

١٠٩

لێیان پرسیم
بڕوات بە بوونی خودا هەیە؟
بە نیگەرانییەوە وەڵامم داوە:
لە کاتی دژوارییەکانما
هیچ خودایەکم نەبینی.

١١٠

هەموو ژیانم نامەیەک بوو
هیچ کات نەگەیشت
بە هیچ کەس
هیچ کاتیش ناگات
ئاخ لە نەگەیشتن

ن

ه

گ

ه

ی

ش

ت

ن

سەرەتای هاوینی دوو هەزار و هەژدە تا سەرەتای بەهاری دوو هەزار و بیست و یەک.

هەزار هاواری بێدەنگ لە ناخمدا دەناڵێنن. هەزار قریشکەی مەلول لە مێشکمدا زاری خۆیان گرتووە، هەزاران رستەی ئاگرین لە هەناومدا جوانەمەرگ بوون. رێم نەدا هیچیان لە دایک ببن، هەموو ئەمانەش بە خشکەیی و بە دزیی ئاگاییمەوە لە زیندانە نوتکەکانی ئەندێشەمدا رایانکرد و هەرگیز نەمتوانی بیانگرمەوە.